لە :

# ڕێزمان و وشەنامەی زمانی کوردی

ماوریتسیۆ گارزۆنی

ڕۆما

١٧٨٧

تۆژەر و وەرگێڕ : شێرکۆ هەژار

٢٠١٨

ئارشیف : هێدی(جەعفەری حوسێنپوور)

ئەم کارمم بەتایبەتی بە ئارشیفی هێدی ( کاکە جەعفەری حوسێنپوور)ی

بەرز و بەڕێز پێشکەش دەکەم

ساڵی رابرد، بەشی ئەوەندە فێری زمای ئیتالی بووم کە بتوانم کتێبی پێ بخوێنمەوە و، لێوەربگێڕم . ئەوجا ئەم کتێبەی"گارزۆنی"یم لە ئینتەرنێتدا پەیداکرد و گوتم با هەمووی بکەمە کوردی و پێشکەشی" هێدی"ی زانا و خۆشەویستی بکەم . بەڵام کە دیتم کتێبەکە چ وێرانەیەکە، لەوە پەشیمان بوومەوە کە بنووسم " پێشکەشە بە هێدی" ، پێم وابوو ئەمە شایانی ئەوە نەبوو بە پێشکەشی بدرێ بەو، بەڵام لە لایەکی ترەوە ، خۆ " ئارشیف " شتێکی ترە و،دەکرێت هەرکتێبێک بگرێتەوە و، ئەوەندەی من لە ئەزموونیفەیسبووکمەوە بزانم، کەس لە نووسەران و شاعیران و تۆژەرانی تری کورد، بۆ ئاگاداری لە ئارشیفی سەرچاوەکان لە بارەی زمان و فەرهەنگی کوردەوە وەکو هێدی بە توانا نیە . ئیتر بڕیارم دا بەتایبەتی پێشکەشی ئارشیفەکەی بکەم .

هێدی گیان، کاکە جەعفەری رۆشنبیری گەورە، مرۆڤی زۆر لە دەوروبەری خۆت گەورەتر، ئەم کتێبە بۆ ئارشیفی تۆیە .

شێرکۆ هەژار

## ئەم کتێبە و دانەری و ئەم کارەی من

" ماوریتسیۆ گارزۆنی"ی دانەری کتێبی" رێزمان و وشەنامەی زمانی کوردی"ی چاپی ١٧٨٧ی چاپخانەی " کۆڕی پیرۆزی پڕۆپاگەندەی‌عەقیدە"ی کلیسای کاتولیک لە رۆما، کەشەیەکی بڵاوکەرەوەی مەسیحییەتی‌کاتولیک بووە، ساڵی١٧٦٢بە کاری ئاینی چووەتە مووسڵ و، دوو ساڵ دوای ئەوە لە مووسڵەوە چووەتە " ئامێدی"و دەڵێت ئیتر پتر لە ١٨ ساڵ لای کوردان بووە . ئەوجا ئەم کتێبەی بۆ کلیسا داناوە، تاکو کەشەی تر بۆ بڵاوکرد- نەوەی مەسیحییەت لە کوردستان کەڵکی لێ‌ببینن . کلیسا بۆ ئەوە زۆر رێزی لێ ناوە و، گارزۆنی بەهۆی ئەم کتێبەیەوە بە " باوکی کوردۆلۆجیا " ناوبراوە .

سا بۆ بەدبەختیی‌کلیسا بووبێت، یا بۆ خۆش‌بەختیی‌دوژمنانی، ئەوا گارزۆنی پیاوی زمان و رێزمان نەبووە . هەر بەنموونە : پتر لەهەژدە ساڵ لە ئامێدی بووە و، بەشی‌ئەوەندە لە زمانی‌خەڵکەکە نەگەیشتووە کە ئیزافەی ناوی مێ بە " ا " و ئیزافەی ناوی نێر بە " ێ " دەکەن : دەڵێن " جیرانا من" ئەگەر هاوسێکە مێ بێت و، " جیرانێ من " ئەگەر هاوسێکە نێر بێت . کاتێک بیستوویە دەڵێن : دایکا من، وای تێگەیشتووە و خستوویەتە رێزمانەکە- یەوە کە ئەگەر ناو بە " ک " کۆتایی‌هات( وەکو" دایک")، ئەوا بە " ا "ئیزافە دەکرێت : دایکا من . مەگەر پتر لە هەژدە ساڵ لە ئامێدی بووبێت دەکرێت "لاوکێ من " و" باڤکێ من " و "کالکێ من" و "دارکێ من" ی نەبیستبێت ؟

گارزۆنی ویستوویە پیتی لاتین بۆ خوێندنەوەی کوردیی ئەم کتێبەی دابنێ و، بە خەیاڵی خۆی دایناوە، بەنموونە : دەڵێت خەتێک لەسەر پیتیK دەکێشم تاکو بە "ق"بخوێندرێتەوە،

کەچی هەموو K یەکان بە خەتبەسەر و بێخەت وەکو یەک بۆ " ک " و " ق " و "خ" یش بەکاردەهێنێت، کە پیتی تریشی بۆ هێندێک لەوانە بەکارهێناوە، هەمان پاشاگەر- دانی لە بەکارهێنانی چەند لە پیتەکانی تریشیدا هەیە، ئێ کەشەی کە بیەوێت کوردی بەم کتێبەی ئەو فێرببێت، کامە وشەی کوردی بەو پیتانە بە کامە شێوەیان بخوێنێتەوە ؟

گارزۆنی، کە نەیتوانیوە "ا"ی" دایکا من" تێبگات، چووە بڕیاری لەسەر مێژووی چەند هەزار ساڵی زمانی کوردی و فارسیش داوە، دەڵێت : زمانی کوردی لە فارسییەوە هاتووە و بە تێچوونی زۆر وشەی عارەبی و کلدانی جیابووەتەوە . ئاخر ئەوە چۆن دەکرێت ؟ ئێستا ئێمە دەڵێین کە ئیتالی و فەرەنسی و سپانی و کاتالانی و پۆرتوگالی لە لاتینەوە هاتوون، مەگەر دەکرێت بڵێین ئیتالی لە فەرەنسییەوە هاتووە یا کاتالانی لە سپانی؟ مەگەر هەموویان شێوازی جیاوازی هەمان زمان نەبوون؟ ئەی فارسی وکوردی، ئەگەر پێش چەند هەزار ساڵ یەک زمان بووبن، مەگەر ئەو یەک زمانەی ئەسڵەکەش هەر فارسی بووە و ئێستاش فارسیی دوای چەند هەزار ساڵی ئەوە هەر هەمان شتە ؟ کە ناکرێت هەمانشت بێت، بۆچی ناویئەسڵەکەی هەرتکیان دەکەیت بە فارسی ؟ خۆ فارس ستانێک لە ستانەکانی میدیا بووە و لە دوای میدیا هاتووەتە سەر شانۆ . ئەوجا کە وشەی عارەبی و کلدانی لە زمانی فارسیدا چەند ئەوەندەی ئەوانەی لە کوردیدان، بە ئەو مەنتیقە دەبێت زمانیفارسەکان گۆڕابێت و، بە ئەوهەمووە عارەبی و کلدانییە تێدا لە کوردییەکەی دوورکەوتبێتەوە . من لێرەدا تەنیا "مەنتیق"ی گارزۆنی هەڵدەسەنگێنم و، دووریی لە

تێگەیشتنی دنیای مێژووی پەرسەندنی زمانەکان و،گۆترەکاریی حوکمی دەبینم و هیچی تر. گارزۆنی نوختەکانی پیتیعارەبی و ئیشارەتەکانی سەر و ژێریشی خستوونەتە یەک ریزەوە و، پاراگرافیکی ئاڵۆزی بە زمانی لاتین لەو رووەوە بۆ نووسیون، کە من لە شوێنی خۆیدا روونیدەکەمەوە .

گارزۆنی، کوردستان لە پێنج ئەمارەتدا خولاسە دەکاتەوە و، باسی مەرکەزێکی گرنگی مەسیحییەکانیش لە هەکاری دەکات، کەچی پێنج ئەمارەتەکەی باسیان دەکات هەکاری ناگرنەوە . وێناچێت گارزۆنی قەت هیچ شتێکی لە رەوشت و فەرهەنگی کۆمەڵگەی کورد بەشی ئەوەندە بە دڵ بووبێت کە ئیشارەتێکی پێ بکات .

کاتێکعەشیرەتیکوردان و ئاکاری میرانیان بە وەحشی باسدەکات، بە پێویستی نازانێت بەراوردێکیان بە دەرەبەگەکانی ئەوروپا بکات، بەنموونە بڵێت : بەڵام ئاغاکانی کوردان وەکو هێندێک لەوانەی ئێمە " Jus Primae Noctis مافی شەوی یەکەمی بووکی رەعیەتەکانیان" نیە .

شتێکی کە بە جیددی سەرنجی منی راکێشا، فەسڵی " ئاخافتنا بەین دوو ئاغا موسولمان" بوو، کە بە کوردی و وەرگێرانەکەی بە ئیتالی بۆ مەشقکردن نووسیوە، بە خۆم نەبوو زۆری پێپێکەنیم . دەبێت گارزۆنی بەوجۆرە کوردیی لەگەڵ خەڵکی ئامێدیدا گوتبێت و، دەبێت ئەوان دوای ئەوە لە نێوان خۆیاندا چ بەزمێکی خۆشی لاساکردنەوەیان لێ سازدابێت، لێرەدا بیرم بۆ کاک سەرداری نووسەری خۆشەویست دەچێت، ئەگەر ئەوە ببینێت، دەبێت ئیلهامی نووسینی چ ساتیرێکی بداتێت .

قامووسەکەشی، یا وشەنامەکەی، ئەوسا هەرکەڵکێکی بووبێت یا نەبووبێت، ئەمڕۆ ئیتر بەڕاستی هیچکەڵکێکی بۆ کەس تێدا نیە .

کتێبەکە، چاپیشی زۆر جوان نیە و، هەڵەی چاپی کەم نین . هەرچەندە دوولاپەڕەی بۆ لیستی هەڵەی چاپی وشە کوردییەکان و راستکردنەویان وێخستووە، بەڵام هەڵەی چاپی لەوە پتر تێدا هەیە، هەڵە لە نووسینی ئیتالییەکەشدا - کە دەڵێت بە پێویستی‌نەزانیوە راستی‌بکاتەوە- کەم نیە، تەنانەت هەڵە لە ژمارەی لاپەڕەکانیشدا هەیە : لەسەر لاپەڕە ١١١ نووسراوە ١١٣ و، لەسەر لاپەڕە ٢٠٤ نووسراوە ٢٠٨ .

بەڵام ئیدی لە رووی مێژوویەوە، کتێبی ئەوروپاییەکە کە پێش پتر لە ٢٣١ ساڵ* لە رۆما چاپ کراوە و باسی کورد و کوردستان و زمان و رێزمانی کوردیی کردووە و، لە کتێبخانەدا شوێنێکی‌گرتووە، لەبەرئەوە، نابەجێ نابێت کە لێی ئاگادار بین و، شتێکمان لە کارەکەی بە کوردی لە کتێبخانە هەژارەکەی خۆماندا هەبێت.

تێبینی : هەرچی لە ناو ئەمجۆرە کەوانانەدایە : [ ]، چ ناوی" وەرگێڕ"ی بەدووەوە نووسرابێت و چ نەنووسرابێت، ئەوە روونکردنەوەی منە .

شێرکۆ هەژار

---

* تاریخی ١٧٨٧ لەسەر بەرگی ئەم نوسخەیەی کتێبەکە هەیە، بەڵام بەگوێرەی سەنەدێکی ١٧٨٦ی کە لە کۆتایی کتێبەکەدایە، ئەمە چاپی یەکەمی نیە .

# GRAMMATICA
## E VOCABOLARIO
*DELLA*
## LINGUA KURDA

COMPOSTI

DAL P. MAURIZIO GARZONI

De' Predicatori Ex-Missionario Apostolico




ROMA MDCCLXXXVII.

Nella Stamperia della Sacra Congregazione
di Propaganda Fide

CON LICENZA DE' SUPERIORI.

زمـانـی کـوردی، هێشتا لە ئـەوروپا نـەناسراوە، زمانێکە ناخۆش نایەتە بەرگوێ، هی ئـەو وڵاتەیە کە پێی‌دەڵێن کـوردسـتان، کە لە نـاو سـنوورەکانی میسـۆپـۆتامیا و ئێرانـ (Persia)دایە . بە ئەسڵ لە فارسییەوە هاتووە و بە تێپەڕینی رۆژگار شێواوە : زۆر وشـەی‌عارەبیی وەرگرتوون و، وشـە و عیبارەتی تری کلدانی‌یش، کە بەوە ئیتر چـەند سەدەیەکە بووە بە زمانێکی بە تەواوی لەوانی تر جیاواز و ناوێکی‌خۆی وەرگرتووە . وڵاتەکە، بە درێژی، رێگای نیزیکەی‌بیستوپێنج رۆژ و بە پانی نیزیکەی دە رۆژە . بە پێنج ئەمارەتی گەورەی مسوڵمانـ(Maomettani محەممەدی)ی تابیعی سـەردەرانەی عوسمانی دابەش‌دەبێت و، هێندێکیشیان هێندێک جار تابیعی فارسـەکانن i Persiani . ئەوانە بریتین لە : ئەمارەتی Betlis بەتلیس؛ ئەمارەتی Gezira جەزیرە، کە هێندێک جوغرافیاناس پێی‌دەڵێن دەوڵەتی پـادشـایی بـۆتـانییەکان؛ ئەمارەتی Amadía عمادیـە [ئامێدی]؛ ئەمارەتی Giulamerk جولەمەرک؛ ئەمارەتی Karaciolan قەرەچۆلان(١)

---

(١) هـەرچەندە بەشێکیش نین لە کوردسـتان، دەکرێت : چیای سـەنجار Sangiár ی نێوان مووسڵ و رووبـاری خابـوور Kabúr یش بخەینە سەر ئەوانە، کە خـەڵکەکەی یـەزیدین و هیچ زمانێکی تری جگە لە کوردییان نیە ( قەومێکی وەحشی Nazione barbari لای کاروانی‌گەورە ناسراون، کە یەزیدی نیزیکەی‌هەموو ساڵێک رووتیان دەکەن) و پشت دەشتی زۆری نێوان مووسڵ، نیسیبی Nisibi و ئورفەش کە قەومانی کوردی شەڕکەریان لێ دەژین .

[قەڵاچوالان] . هەر یەکێک لەوانە دەتوانێت لەشکرێکی دوازدەهەزار شەڕکەر یا پتر-یشی هەبێت . ئەمارەتی قەرەچۆلان گەورەترین و بەهێزترینەکەیانە، چونکە لە دوای ١٧٦٠، بە یارمەتیی پاشای‌بەغدا،ئەوەیKoi Sangiak"کۆی‌سەنجاک"یشی وێخراوە کە خەڵکەکە پێی‌دەڵێن"سۆران". بەڵام نەجیبزادەترینەکەیان ئەوەی‌عمادیەیە،کە زنجیرەی نەژادی میرەکانیان دەچێتەوە سەر ئەو فەرمانڕەوایانەی‌کۆنی کە پێیان‌گوتراوە "خەلیفەی بەغدا". وەکو ئەوانەی" جولەمەرک"یش، کە دوو برا بوون، بە ئەوەندەی کە لە شوێنە-واری یادگار و کێڵی‌گۆڕی باو و باپیرانیانەوە دەبینرێت، دیارە لە پێش پترلە پێنج سەدە-وە لە کوردستان نیشتەجێ‌بوون . کاتێک بتەوێت لە کوردێک بزانیت هی کام ئەمارەتە، بەمجۆرە وشانە باسی خۆی دەکات : ئەوانەی ئەمارەتی قەرەچۆلان دەڵێن : سۆران (ئەوانەی تەنیا هەر بە کوردی قسەدەکەن وا دەڵێن، ئەوانی تر بە تورکی دەڵێن : بابان)؛ ئەوانەی عمادیە دەڵێن : Badinan بادینان ؛ ئەوانەی جولەمەرک دەڵێن Sciámbo شامبۆ؛ئەوانەی جەزیرە دەڵێن : Bottán بۆتان؛ ئەوانەی بەتلیس هەر دەڵێن : بەتلیسی . ئەوانە لە قسەکردندا، بەهێندێک‌عیبارەت و دەنگی ئەدایان لێک‌جیادەکرێنەوە، هەر وەکو لە دۆخی ویلایەتەکانی ئیتالیاشدا ئەوە هەیە . بەهەرحاڵ، پاکترینەکەیان ئەوەی‌عمادیەیە کە من لەم کارەی ئێرەمدا بەکاری‌دەهێنم .

کوردەواری،هەمووی چیای ئێجگار زۆر بەرزە،چیایانی کە پێوەندییان بە" تۆرۆس"ـەوە هەیە، بە شێوی ئێجگار زۆر جوانی بە پیت بۆ میوە و چەڵتووک . چیاکانیان بە تایبەتی مازووی زۆر چاکیان زۆر هەیە، کە بازرگانانی بێگانە بازرگانییەکی زۆری پێ دەکەن،

لە ئاسیای‌بچووکەوە دەبیەنە سووریا Sorìa، حەڵەب و، دوای ئەوە بۆ ئەوروپا . مەڕ و بزنی زۆر چاکیشیان لە مێرگە زۆر چاکەکانیاندا زۆر هەن، کە سەرچاوەی زۆرترینی داهاتن . پێدەشتەکان، چ لە بەشی ئێران و چ لە بەشی میسۆپۆتامیا، بۆ گەنم، کەتان، پەموو، کونجی، ئەوپەڕی بە پیتن .

فەرمانڕەوایی‌کردنی میرەکانیان وا نیە کە هەمیشە لە باوکەوە بە میرات بە کوڕی‌بگات، بەڵام کەسێک کە لە هەمان بنەماڵەدا بەهێزترین بێت، دوای مەرگی میر جێگای دەگرێتەوە . ئەو کەسەش قەت هەر وا ئەو جێگایە ناگرێتەوە مەگەر دوای زۆر شەڕان و، خیانەتانی ئەو خەڵکە وەحشی popoli barbari وغەددارەی کە بە ئەوەندە هۆزان دابەش بوون کە پێیان‌دەڵێن "Assiréta " [عەشیرەت] و، کە لەشکرەکانیان لەوانن [ لێرەشدا گارزۆنی کە"ا"یەک وەدوو وشەی‌عەشیرەت دەخات، مانای ئەوەیە کاتێک لە خەڵکی بیستووە گوتوویانە "عەشیرەتا فلان"، نەیزانیوە کە ئەو " ا "یە بۆ ئیزافەیە و بە بەشێک لە وشەکەی وەرگرتووە ]. هەرعەشیرەتە و سەرۆکی خۆی هەیە، کە لای میر دەوری هەیە . زۆر وادەبێت، ئەو عەشیرەتانە لە میری خۆیان یاخی دەبن و، بە شەڕ رووبەڕووی دەبنەوە و، ئەگەر بە سەرکەوتن شادببن ئەوا میر لا دەدەن و، میرێکی تر دەهێننە سەر حوکم، بەڵام میر هەمیشە لە هەمان بنەماڵە دەبێت .

لەو ئەمارەتانەدا، زۆر مەسیحی، بە ژمارە پتر لە سەدهەزار هەن . بەشی زۆریان نەستورین و، بە دوو پاتریارکی دابەش‌دەبن . یەکێک لە پاتریارکەکان لەKocianisi کۆچانیسی‌ی نیزیکی جولەمەرکە، کە هەر بە Mar Simon مارسیمۆن ناودەبرێت و،

پێنج" ئوسقوفیپاریدەدەر"ی‌هەن [ قۆچانیس>قودشانیس= پیرۆز؟، گوندێکە لە هەکاری، لە سەدەی حەڤدەوە تا ١٩١٥ یا بەرەسمی ١٩١٨ مەرکەزی پاتریارکیی ئاسوورییەکان بووە، ئێستا ناوی لە ئیدارەی کۆماریتورکیادا کراوە بە : کۆناک - وەرگێر] . ئەوەکەی تر لە دێرێک دەژی پێی‌دەڵێن Raban Ormes [رەبەن هرمز]، واتا رەبەن ئۆرمیزدا [ ئۆرمیزدا ناوی پاپێکی کاتۆلیکی ئیتالیایی سەدەی ٦یش بووە - وەرگێر]، لە نیزیکی " ئەلقوش"ی شوێنی کورسیی پاتریارکی، کە هەر پێی‌دەڵێنMar Elia مار ئێلیا [ ئێستا وێرانەیەکە - وەرگێر] . دەسەڵاتی کلیسایی ئەم پاتریارکە، لەوەی لە چوارئەمارەتەکەی تری کوردستان بەولاوە، هەموو میسۆپۆتامیا دەگرێتەوە(جگە لە دیاربەکر و ماردین)و، دوو ستانیئێرانیش بە سێزدە" ئوسقوفی پاریدەدەر"ەوە (١). زۆر ئەرمەنیش هەن . ئەم مەسیحییانە ئەوەندە نەزانن، کە کەشەکانیان، بەگشتی بڵێین، بەحاڵ دەزانن بخوێننەوە و، کەمێکیان بنووسن و، لە نەتیجەدا، لە نەزانیی خۆیان، لە بیدعەت و لە قەباحەتاندا نقوم دەبن . ئەوەندەی من توانیومە لێبکۆڵمەوە،هیچ بڵاوکەرەوەیەکیمەسیحییەت لە رۆژگا- ری رابردوودا لەم وڵاتە وەحشییانەدا جێگیر نەبووە و، ئەگەر کەسێک بە رێکەوت بە

---

(١) وەزیفەی پاتریارکی و ئوسقوفی لای نەستورییەکان لە مامەوە بە میرات دەدرێت بە برازا یا بە نیزیکترینی خزمان لە نەژادی باوکەکە لە هەمان بنەماڵەدا . بەوجۆرە وادەبێت کەسێکی تەمەن دوازدە ساڵ وەزیفەی ئوسقوفی دەدرێتێ، وەک کە دوو جار لە سەردەمی ژیانی من لێرە روویداوە .

تێپەڕین چەند رۆژێک لێ مابێتەوە، ئەوا پێویستیکردووە لە ڕێگای دیلمانجێکەوە قسە بکات بێ ئەوە کە بتوانێت مەبەستی بۆ پێکبێت . یەکەم بڵاوکەرەوەی مەسیحییەت کە لە کوردستان مابێتەوە، " لێۆپۆلدۆ سۆلدینی"ی کەشەی رەبەنانی دۆمێنیکانی بووە، لە ساڵی ١٧٦٠ ـەوە و، تا ساڵی ١٧٧٩ی کۆتایی ژیانی لە زاخۆ ی قەڵەمڕەویی عمادیە بووە[رومکناس و ریازیاتناس و بژیشکێکی خەڵکی ڤینیس بووە، ماوەیەک لە لوبنان بووە و ئەوجا چووەتە زاخۆ، لە لوبنان پێیانگوتووە " شێخ لێۆپۆلدۆ " و دەڵێن گوایا جۆرێک کەراماتی هەبووە و گۆڕەکەی لە زاخۆ مەزارە یا مەزار بووە ؟ -وەرگێڕ]. دووەم کەس من بووم، کە ساڵی ١٧٦٤ لە شاری مووسڵ دەرچووم و مووسڵم بۆ بڵاوکەرەوەکانی تری مەسیحییەتم بەجێهێشت(١) و چوومە عمادیە. نازانم بڵێم چەندە بەڕاستی زەحمەت بوو بە بێ یارمەتیی رێزمانێک یا کتێبێک فێری زمانێک ببم، چونکە کورد،بۆ نووسین،

---

(١) بۆ بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت، کاپۆچینییەکان [ لقیکی کاتولیک] کە ئێستا ئیتر لە مووسڵ نەمابوون، ئەمجارە کەشەیدۆمێنیکانی [لقیکیدەرویشییکاتولیک] ساڵی١٧٥٠ لە لایەن کۆڕی پرۆپاگەندەی پیرۆزەوە بۆ مووسڵ رەوانە کران . ئەوش ئەوە بوو کە بێنێدیتتۆی چاردەیەم [ پاپ] بۆ ئەوە ملی بۆ داوای کەشەیەکی کاتولیکی کلدانی دا کە ناوی Kas Keder [قس قدیر؟] بوو و، لە دەست چەوساندنەوەی زۆری پاتریارکی نەستۆری لە مووسڵ رایکردبوو، یا لە رۆما خانەنشین بوو و تا کۆتایی ژیانی لەوێ بەسەربرد .

زمانی ئەدەبیی فارسی بەکاردەهێنن، کە کەسیان جگە لە خوێندەوارەکانیان نایزانێت . مەسیحییەکان لەناویاندا کتێبی‌تایبەتی بە زمانی‌خۆیان بەکاردەهێنن، واتا : نەستورییەکان بە زمانی کلدانی، یەعقووبییەکان بە زمانی سریانیSiriana و، ئەرمەنەکان بە زمانی ئەرمەنی . بەڵام دەبێت هەموویان کوردی بزانن، چونکە ئەوەیان نەک هەر تەنیا بۆ سەودا و مامەڵە لەگەڵ مسوڵمانەکاندا پێویستە، بگرە هەر بۆ نێوانیان لەگەڵ ئاغاکانی خۆشیاندا پێ‌دەوێت(١). بە بیرکردنەوە لەو زەحمەتییانە و، بەوە کە من، بۆ ئەوەندەی کە ئەوروپاییەک دەتوانێت فێری‌ببێت، زمانی کوردی باش فێربووم، پتر لە ١٨ساڵ تێکەڵی کوردان بووم، بڕیارم دا، بۆ هاسانکاری بۆ کەسانی نوێی بڵاوکەرەوەی مەسیحییەت، کتێبێکی ڕێزمان و وشەنامەی کوردی دابنێم . بیری وەها کارێک، لە یەکەم لەحزەدا زۆری ترساندم؛ بەڵام بە زۆر بیرلێ‌کردنەوە و، لێکدانەوەی لە سەری خۆمدا و، ڕێکخستنی هەموو حاڵەتەکانی زمانی کوردی، لەدواییدا، دوای ماندووبوونێکی زۆر، توانیم بگەمە بیری ئەوەی چۆن بناغەکانی ڕێزمانی کوردی دابڕێژم . ددان بەو حەقیقە-

---

(١) لە کوردستان، هەم مەسیحی و هەم جوو هەن کە هەر لە لەدایکبوونەوە ڕەعیەتی ئاغاوەتی مسوڵمانن، ئاغاوەتی کە دەسەڵاتیان بە سەر ئەوانەدا هەیە و، جگە لە ڕێو- شوێنی ژیانی ئاسایی، پارەیەکی دیارکراویان لێ داوادەکەن، وێڕای پێشکەشی و، کار و، دەتوانن خێزان لەوانە بە خۆڕایی یا بە فرۆشتن، هەر وەک هەمیشە ملکیان بن، بدەن بە کەسانێکی تر .

تەدا دەنێم کە ئەم ڕێزمانە، لە بەشەکانیدا، بێعەیب نیە، بەڵام پیاوانی ژیر لەوەدا دەمبەخشن کە من یەکەم کەسێکم بە بێ یارمەتیی هیچ کەسێک، بە بێ کتێبی ئەو زمانە، دەست بۆ ئەو کارە دەبەم، باسی دنیای ئەو زمانەی هێشتا نەناسراو، بە مەبەستی یەتیی یارمەتیدانی کەسانی داهاتووی بڵاوکردنەوەی مەسیحییەت دەخەمە بەرچاو . بەڵام هیچ کەسێکیش ناتوانێت نکوڵی لەوە بکات کە من بەم کارەم ڕێگای تەواوکردنیم بۆ ئەو کەسە خۆش کردووە کە دەبێت ڕۆژانێک ئەم زمانە بەکاربهێنێت . هەرچەندە ئەوە دڵخوازە کە بڵاوکەرەوەی مەسیحییەت زمانی تایبەتی مەسیحییەکانیان بزانن، بەڵام بەجێهێنانی وا هاسان نیە . فێربوونی ئەوە کاتێکی زۆری پێدەوێت و، ئەوە لە کاتیان بۆ ئەرکی ئیرشاد و هیدایەتی ئەو مەسیحییانە دەگرێت، کە بۆ ئەوە هەر ئەو زمانە کوردییەیان پێدەوێت کە زمانی گشتیی هەموانە .

بەوە کە کوردستان ، وڵاتی لە نێوان سنوورەکانی ئێران و ژێر ئیمپراتۆریی عوسمانی، زۆرتر شوێنی شۆرشانی جیاواز بووە، دەکرێت حاڵەتی دیارکراو باس بکەین چۆن بڵاوکەرەوەی مەسیحییەت ناچاربوون لەو شوێنانە بڕۆن و، چەند سەدەی بەسەرچووە تا لە تواناد‌ا بووە سەرلەنوێ کەسانێکی تر بنێردرێنە ئەو شوێنانە . لەم حاڵەتەدا، ئەم کارەی من دەویسترێت و، یارمەتیی ئەوە دەدات " سەرەتا بنچینەییەکان"ی زمانی کوردیی جێیباس بەدەستەوە بێت، بێ ئەوە پێویست بکات کاتی زێدە بۆ ئەوە لەدەست بدرێت - وەک کە هەرکەسێک دەکرێت ئەوە بهێنێتە بەرچاوی .

ئیتر واسە، ئەمە مەبەستی من بووە و، بۆ ئەوە خۆم بۆ دانانی ڕێزمان و وشەنامەیەکی

کوردی - ئیتالی ماندووکردووه . تـکا دەکەم، هـەر دڵسۆزێکی میهرەبان کەمایەسییەکی تێدا ببینێت، کەسانێکی تر بتوانن چاکی بکەن . [ وشـەنـامەکەی " ئیتالی- کـوردی"یـە، نەک کـوردی- ئیتالی] .

.

کورد پیتی فارسی بەکاردەهێنن و، هەموو نووسینی گشتییان بە زمانی ئەدەبیی فارسی دەنووسن، بە جۆرێک کە ئەگەر لە ڕێگای خوێندەوارەکانیانەوە نەبێت ئەوا هیچ لە زمانی نووسراوەکان ناگەن، ئەو خوێندەوارانەیان کە ئەوە دەخوێنن تا بتوانن نانێکی بەحورمەت پەیدابکەن . لەهەموو دێیەک معاشێک دەدەن بە کەسێک بۆ ئەوە کە نەک هەر دەتوانێت فارسی بخوێنێتەوە، بگرە دەشتوانێت بۆیان وەربگێڕێتە سەر زمانی کوردیش و، ئەو کەسە پێیدەڵێن " مەلا Mella " . ئەوە ڕاستە کە نامەی نارەسمی، شیعر و گۆرانییان بە زمانی خۆیانن، بەڵام بۆ نووسین، بە پیتی فارسییان دەنووسن . بۆ کەڵکی ئەو کەسەی دەیکات یا دەیەوێت فێری خوێندنەوەی فارسی و عارەبی بە دوودا ببێت، نامیلکەی چاپکراوی " کۆڕی پڕۆپاگەندەی پیرۆز "ی ساڵی ١٦٣٣ هەیە . زمانی کوردی، زۆری لەو دوو زمانە تێدایە . بەڵام مەبەستی من، وەک لە پێشەکییەکەدا گوتم، ئەوەیە کە ئەم ڕێزمانە زۆرتر بۆ ئەو بڵاوکەرەوانەی مەسیحییەت دابنێم کە هیچ لەو زمانانەیباسکراو ئاگادار نین و، دەشبێت لەو وڵاتانە کاربکەن، لەبەر ئەوە بە پیتی ئیتالیی دەنووسم، کە دیارە ئەوەش پیتەکانی دەنگی قوڕگی و ئیتریشی تێدا نیە . بۆ پڕکردنەوەی ئەو کەمایەسییە، پێویستە بۆ ڕوونکردنەوە چەند ئیشارەتێک لەسەر پیتەکانمان دابنێم، بەو مەبەستە کە بەوشێوەیە خوێندنەوەکەیان وەکو کوردییەکەی دەرچێت . ئیشارەتەکان بەمجۆرە کاردەکەن :

Ā وا خەتێک بەسەرەوە، بۆ دەنگی قوڕگیی وەکو ئەوەیعارەبیی پیتەکە[عا، عە].

C̈ وا دوو نوختە بەسەرەوە بۆ" G " ی نەرم [ ج ] .

D̈ وا دوو نوختە بەسەرەوە بۆ " د"یەکی کەمێک لە نێوان ددانانەوە دەرچێت .

G̈ وا دوو نوختە بەسەرەوە ، هەمان وەک " C̈ " [ ج، بەڵام بە بێ دوونوختەشی

لەسەر بۆ"ج" بەکارهێناوە:Pengiah پەنجاهـ، کە G بەگوێرەی رێنووسی

ئیتالی ئەگەر e یا i ی بەدوودا بێت بە ج دەخوێندرێتەوە؛بۆچی سێ پیت بۆ ج؟] .

Gh وەکو G ی ئیتالیی Ga,Go,Gu [ گـ] .

GH̄ وا یەک خەت بەسەر هەردووکیانەوە، بۆ دەنگی قوڕگیی وەک "غەین"ی عارەبی

[ غ ] .

K̄ وا خەتێک بە سەرەوە بۆ دەنگی کەمێک قوڕگیی وەکو" قاف"یعارەبی [ بەڵام

گارزۆنی هەم K و هەم K̄ ی بۆ" ق "و بۆ"خ " و بۆ" کـ"یش بەکارهێناوە،

بە نموونە : K̄aim قایم،K̄vrma خورما، bokolum بکۆڵم، kabul

قەبوول، Zako زاخۆ ، Kurmáng̈ کورمانج ] .

H بەدووی پیتی دەنگدارەوە بۆ ئەوەیە کە پیتە دەنگدارەکە بە هەناسەکێشانەوە

بگوترێت.

HH بەوجۆرە بەدووی پیتی دەنگدارەوە بۆ ئەوەیە کە پیتە دەنگدارەکە بە دەنگی

قووڵی قوڕگی و نیمچە هەناسەکێشانەوە بگوترێت، وەکو Ha ی عارەبی،

کە گوتنی بۆ ئیتالییان هەرە زەحمەتە، ئەوەیە کە پیتیهەشتەمی ئەلف-بێی

فارسییە[ ح ] .

Sc یا " شین"ی عارەبی، وەکو ئیتالییەکەیە بـەڵام بەدووی A, O, V یشەوە هەر بە

" ش " دەخوێندرێتەوە [ ئەوە لە ئیتالیدا هەر ئـەگـەر e یا i ی بەدوودا بێت بە

" ش" دەخـوێندرێتەوە، بـەڵام گارزۆنی وادەبێت " ش" هـەر بە S دەنووسـێت :

Pasi پاشی]، چونکە ئـەگەر بمەوێت بە کـوردی بنووسم " سکالا"، دەنووسم :

Skala [ ئـەو قسـەیە بـەڵێ کە K لە ئەلف-بێ ی ئیتالیدا نیە و نـاچارە دەنگـی

" ک" ی دوای " س" وەها بنووسـێت، هـەرچەندە نـووسینی ئیتالی چـارەی بـۆ

ئەو کێشـەیە هەیە، لێرەدا " ک" بە "ch " دەنووسـێت و، وشـەی غـەیرە ئیتالی

بە پیتی تری لاتین وەکو خۆی دەنووسێت، بەنموونە: whisky، بەڵام گارزۆنی

" کـورد" و " کـوردسـتان"ی بە ئیتالییەکەش لە هـەمـوو کتێبەکەیدا و لە نـاوی

کتێبەکەشیدا بۆ کـەشە ئیتالییەکان هـەر بە K نووسیوە؛ ئەگەر ئەوەی بە وشەی

بێگانە وەها وەرگرتبێت بۆچی لە وشـەنامەکەیدا Curdo ی نووسـیوە ؟ - کە

لەوێشدا کوردییەکەی بەرانبەری هەر بە K نووسیوە ].

T̈ وا دوو نوختە بەسەرەوە بۆ ئەوەیە کە کەمێک لە نێوان ددانەکانەوە بگوترێت.

U وەکو ئەوەکەی ئێمەیە [ وەکو ئیتالییەکە، وەکو لاتینی کوردی باکوور] .

V بە پیتی بێدەنگ، گـوتنەکەی لە نێوان O و U دا دەبێـت، بـەڵام کاتێک وا بە پیتی

بێدەنگ دوا پیتی وشـە بێت و نیوە بڕگـە(سـیلاب)ێک بێـت، دەبێـت بە لێـوی

ژێـرەوە هێـنان بۆ ددانـەکان بگـوترێت، کە دەبێـتـە نیزیکـەی نیمچـە Uیـەک،

بە نموونە : De,v دەڤ - واتا دەم، Le,v لێڤ - واتا لێو [ ڤ، بەڵام ئەوە لە جیاتی u یش بەکاردەهێنێت : kvzi خوزی بە مانای خۆزیا، خۆزگە - بە kvžïیشی دەنوسێت. دوو جار ئەو پیتە vv بۆ"و W" بەکاردەهێنیت]. و kuzi

Ẍ وا دوو نوختە بەسەرەوە،دەبێت لە نێوان" X کس" و " Z ز"ی ئێمە بگوترێت [ ژ، بەڵام وادەبێت z بۆ " ژ "بەکاردەهێنێت : az bezium ئەز بێژم] .

Ž̈ وا دوو نوختە بەسەرەوە، شتێک لە S و لە Z بە نەرمی، وەکو صادی عارەبی و ضادیش[ بەنموونە دەنووسێت : raži رازی، وادیارە لە ژێرئەسیری نووسینی فارسیدا ئەوەی بە پێویست دیتووە] .

, ئەم ئیشارەتە لە دووی پیتی بێدەنگی سەرەتای وشە بۆ ئەوەیە کە ئەو پیتە وا بخوێندرێتەوە وەک کە سەربەخۆ بێت، وەک برگەیەکی بەجیا بێت، بە نموونە : T,vem بە کوردی واتا " Amo " [ I love ]، دەبێت وەکو Tevem بخوێندرێتەوە [ دڤێم، دەمەوێت ] .

بەڵام حەتمەن هیچ ئیتالییەک، ئەگەر مەشقێکی زۆر نەکات و، قسە بەو زمانانە لەگەڵ خاوەن زمانەکان نەکات، ناتوانێت زمانە رۆژهەڵاتییەکان، عارەبی، فارسی، کلدانی و ئیدی باش بڵێت . من دەتوانم زۆر بە ئەمانەت ئەزموونی خۆم لەوەی خۆم دیتوومە بڵێم، کە زۆر کەم ئەوروپایی هەن کە دوای ئەوەش چاک فێری خوێندنەوە و نووسین بەو زمانانە دەبن،بە قسەکردنیان نەناسرێنەوە کە بێگانەن- دیارە بێلەوانەی کە لە منداڵییەوە

چوونەتە رۆژهەڵات . بەو ئەندێشەیە لێرەدا ئەلف بێ ی باسکراو پێشکەش دەکەم، ئەوجا دەچمە سەر باسی رێزمانەکە .

[ ئەلف-بێ ی فارسی و پیتانێکی بە ناوی لاتینەکەی بەرانبەری لە سێ لاپەڕەی دوای ئەمەدا دەخاتە بەرچاو : " با خط فارسی، با خط فرانکی لاتین"، کە لەگەڵ ئەم قسانەی ئێرەیدا رێک نایەنەوە . بەنموونە : تێدا - بە شێوەی نووسینی تورکییعوسمانی – سێ نوختەی خستووەتە سەر ک : " ڪ" و بەوە کردوویە بە " گ" ( لە مەغریب وەهایە، لای عوسمانییەکان جۆرێک دەنگی ng بووە)، لە کاتێکدا کە gh ی بۆ " گ " داناوە؛ لامئەلفلا شی بە شێوەیەکی وەک"لا" نووسیوە، نەک لا . ئەوجا رێک بە دووی لیستی ئەو ئەلف-بێیەدا، پاراگرافیکی ئاڵۆزی بە زمانی لاتین نووسیوە . من وێنەی هەر سێ لاپەڕە لێرەدا بڵاو دەکەمەوە، دوای ئەوە وەرگێڕانی پاراگرافە لاتینەکە بە کوردی و، ڕوونیدەکەمەوە دەیەوێت بەوە چی بڵێت، ئەوجا درێژە بە وەرگێڕانی ئیتالییەکە دەدەم - وەرگێڕ ] .

# ALPHABETUM PERSICUM

| Latinum. | | | | Persicum. | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| باخا فرانکی لاتین | | | | باخا فارسی | | |
| 1 | A | a | alif | الیف | ا | ١ |
| 2 | B | b | be | به | ب | |
| 3 | P | p | pe | په | پ | ٣ |
| 4 | T | t | te | ته | ت | ٤ |
| 5 | T̂ | t̂ | t̂e | ثه | ث | ٥ |
| 6 | G | g | gim | جیم | ج | ٦ |
| 7 | G | g | ge | چه | چ | ٧ |
| 8 | H | h | he | حه | ح | ٨ |
| 9 | Ẋ | ẋ | ẋe | خه | خ | ٩ |
| 10 | D | d | dal | دال | د | ١٠ |
| 11 | Ḋ | ḋ | ḋal | ذال | ذ | ١١ |
| 12 | R | r | re | ره | ر | ١٢ |

13

| Latinum. | | | | Persicum. | | |
|---|---|---|---|---|---|---|
| 13 | Ż Ʒ̇ | ż ż | że że | زه | ز | ١٣ |
| 14 | Ż Ʒ̂ | ʒ̂ ʒ̇ | ʒ̂e ʒ̇e | ژه | ژ | ١٤ |
| 15 | S | ſ | ſin | سين | س | ١٥ |
| 16 | X̂ | x̂ | x̂in | شين | ش | ١٦ |
| 17 | SS | ss | ssad | صاد | ص | ١٧ |
| 18 | Ṡs | ṡs | ṡsad | ضاد | ض | ١٨ |
| 19 | Ƃ | ƃ | ƃa | طا | ط | ١٩ |
| 20 | Ƃ̇ | ƃ̇ | ƃ̇a | ظا | ظ | ٢٠ |
| 21 | A | a | ain | عين | ع | ٢١ |
| 22 | Ġ | ġ | ġain | غين | غ | ٢٢ |
| 23 | F | f | fe | فه | ف | ٢٣ |
| 24 | Q̈ | q̈ | q̈af | قاف | ق | ٢٤ |
| 25 | K | k | kaf | كاف | ك | ٢٥ |
| 26 | K̂ | k̲̂ | k̈af | گاف | گ | ٢٦ |

| Latinum. | | | Persicum. | | |
|---|---|---|---|---|---|
| 27 L | l, | lam | لام | ل | ۲۷ |
| 28 M | m | mim | میم | م | ۲۸ |
| 29 N | n | nun | نون | ن | ۲۹ |
| 30 ℌ | h | he | هه | ه | ۳۰ |
| 31 V | u | vau | واو | و | ۳۱ |
| | | lamalif la | لا لام الیف | | |
| 32 I | i | ie | یه | ی | ۳۲ |

## DE NUMERO, ET FIGURA PUNCTORUM, SIGNORUM, AC LITTERARUM.

Punctorum genera, quibus figurae litterarum utriusque hujus Persici alphabeti multiplicantur; sunt tria: motiones Arabum, quæ vices vocalium gerunt, tres; sed harum motionum figurae duae, signa quinque, figurae litterarum Arabum XVII. tantum; sed per illa tria puncta, sive tres notas, usque ad XXXII. multiplicantur. Similiter ad Persarum, Arabumque prorsus imitationem etiam figurae Latinae praesentis alphabeti multiplicantur.

*Figurae supra litteram*

*Subtus litteram*

NU-

[ وەرگێڕانی دەقی پاراگرافە لاتینەکە بە کوردی ]

« ژمارە، شکڵەکانی نوختەسازی، ئیشارەتەکان، و پیتەکان

جۆرەکانی نوختەی کە پیتەکانی فارسیی پێ زیاد دەبن، سێن : بزووتنەکانیعارەبی، کە کاری پیتە دەنگدارەکان دەکەن، سێ؛ بەڵام ئەو بزووتنانە بە دوو شێوەن : پێنج ئیشارەت، تەنیا ١٧ شکڵی پیتی عارەبی پێکدەهێنن؛ بەڵام لە ڕێگای ئەو سێ نوختەیەوە، یا سێ ئیشارەتەوە، پیتەکان دەبن بە ٣٢ . بە هەمان شێوەی فارسی و عارەبی، بە لاساکردنەوەیەکی تەواو، شکڵەکانی ئەلف-بێی لاتینیش زیادبوون .

شکڵی سەری نوختەکان

ئەوەی ژێر نوختەکان . »

[ گارزۆنی بەوە دەیەوێت بڵێت :

پیتی نووسینی فارسی، هەمان ئەوانەیعارەبین . نووسینیعارەبی، سێ جۆرەئیشارەتی هەن : یەک نوختە، دوو نوختە، سێ نوختە؛ وەکو : نـ، تـ، ثـ . پێنج ئیشارەتی سەر و ژێر و ... ئەوانەشی هەن . ئەو پیتانەی کە بە هۆی ئیشارەتی نوختەوە بوون بە پیتی جیاواز، لە عارەبیدا ١٤ دانەن، فارس " پـ، چـ، ژ"یان بە ژمارەی سێ نوختە لێ زیاد کردوون و کردوویانن بە ١٧و، بەوە هەمووی بووە بە ٣٢ پیت . پیتەکانی لاتینیش بە هەمان شێوە، بە لاساکردنەوەیەکی تەواو، بەوەندە پیت گەیشتوون .

تا ئێرە قسەی گارزۆنی . ئەوجا من دەڵێم :

نـوختەی پیـتیعـارەبی وەکو نـوختەی ئیشـارەتی نـووسـینیعیبری نیە، ئـەوەی عـارەبی کە داهێنانیعـارەبە، بووە بە بـەشـێک لە لەشی پیتەکە، لە ئەسڵەکانی فینیقی و ئارامی و لقەکانی تـری ئـارامی(عیبـری و سـانسـکریت ... ئیدی)دا نـەبـووە و نـیـە ، سـەرەتا لە عـارەبییشـدا نـەبووە، کاتێک ئـایەتەکانی قـورئان لە دەمی پێـغـەمبـەرەوە وەرگیـراون و نووسراون هیچ نوختەیەکیان تێدا نەبووە ." أبوالأسودالدؤلی" ٦٠٣-٦٨٨، ئیشارەتەکانی سەر و ژێری" بە نـوختە" داهێناون،دەڵێن لە سەر داوای ئیمامعەلی بووە تاکو ڕێگایەک بۆ خـوێندنەوەی ڕاسـتی قورئانی عـارەبی بۆ ئەو نـاعـارەبانەی کە دەبوون بە مسـوڵمان بدۆزرێتەوە . بـەڵام داهێنانی پیتیNوێ بە نوختە، ئەوەی گارزۆنی پێیدەڵێت سێ جۆر : یەک نوختە و دوو نوختە و سێ نوختە، کاری" نصر بن عاصم"(کۆچیدوایی : ٧٠٨؟) بووە ." نصر" شاگردێکی" الدؤلی" بووە و، گرنگیی تەئسیری نوختەی لە نووسیندا، لە مامۆسـتاکەیەوە سـەرنجی ڕاکێشـاوە و، بڕیاری داوە کە بە نوختە زۆر لە ئەلف- بێ بە ئەسڵئارامییەکە بگۆڕێت و بەمجۆرەی لێکردووە . بەوە، دوو جۆرە نوختە کەوتوونەتە نووسینی عارەبییەوە : ئەوەی سەر و ژێر و ئەوەی پیتەکان، لەبەرئەوە نوختەکانی سەر و ژێـریان بە ڕەنـگی جیـاواز نـووسـیون، تا " الخلیل بن أحمد الفراهیدي" ٧١٨-٧٨٦ نوختەکانی سـەر و ژێری بەم ئیشـارەتانە گـۆڕیون کە ئێسـتا هەن و ئیتر نوختە هـەر بۆ پیتەکان ماونەتەوە . بەو نوختانەی " بنعاصم" ئیدی زۆر لە پیتە بە ئەسڵ ئارامییەکان هەر پێویست نابن و، هێندێکی تری نوێی پێداویستیعارەبییشی پێ دروست دەبن . ئەوە کە دەڵێن(بە نموونە جرجی زیدان١٨٦١-١٩١٤) عارەب شەش پیتی" ثخذ ضظغ "یان

له یەمەن وەرگرتوون و خستوونەتە سەر ٢٢پیتە ئارامییەکە، دیارە مەبەست لە"فکرە"ی داهێنانی پیتە بۆ ئەو شەش دەنگە، ئەینا پیتەکانخۆیان هەر مۆدێلێکیعارەبییانە لەهەمان پیتە ئارامییەکانن، ئەگەر نوختە لەو شەش پیتانەی لێیان زیادکردووە لابدەین دەبینین هەمان بە ئەسڵ ئارامییەکانن . بەنموونە : پیتی"خ" لە ئارامیدا نەبووە، هەمان"ح" بووە، وەکو عیبریی ئێستا، کە بە " ح "و" خ " یش خوێندراوەتەوە؛ " س " لە ئارامیدا یەک بازنە بووە، لە وشەی" سامک"، واتا : "کۆڵەکە"؛ " ش" سێ ددان بووە، سامییەکانی تر بە ددانیان گوتووە : شین، عارەب گوتوویانە : سن، عارەب سێ ددانەکەیان کردووە بە " س"، بە شێوەی عارەبیی وشەی ددان و، گوتوویانە ئەگەر سێ نوختەی لەسەر دابنێین دەبێت بە" ش". ئێستا عیبری هەمان یەک پیتی بۆ" س" و " ش" هەیە کە سێ ددانەکەیە و،ئیشارەتی جیاکردنەوەیانی بە شوێنی نوختەیەک "هەر بۆ کاتی پێویست"هەیە، بەڵام لە نووسینیئاساییدا، بڵێین لە رۆژنامە و گۆڤاردا ئەو نوختەیە نیە، خوێنەرخۆی بە گوێرەی شوێن جیایان دەکاتەوە، جەغزەکەشیان بۆ" س" هەر هەیە، لە کاتێکدا کە عارەب پێویستیان بەو جەغزەی بۆ س نیە . ئێمە تەنیا کاتێک دەکرێت بە نوختەی پیتیعارەبی بڵێین ئیشارەت، ئەگەر بەتەواوی پیتەکان بڵێین ئیشارەت، بەنموونە بڵێین: شکڵیسێددان ئیشارەتی دەنگی"س"یە، کە ئەوەش سنوور لە نێوان پیت و ئیشارەتدا ناهێڵێتەوە . ئەوجا من ئەو لاساکردنەوە تەواوەی لە دوا رستەیدا دەیڵێت، بە قسەیەکی سەیر دەبینم، چونکە کە تۆ- هەربەنموونە- سەیری پیتەکانی نووسینی هەرتک زمانی لاتین و ئیتالییەکەی ئەم کتێبەی گارزۆنیخۆی بکەیت، دەبینیت جگە لە یەک نوختەی سەرi تێدا نیە - وەرگێڕ] .

ژمارەی کوردی

هەمان ئەوانەی فارسین

یەکJek ، دو، سێهـSeh ، چارCiahr ، پێنج Penč ، شەش، هەفتAhft ،

هەشتAhst ، نەهـ، دەهـ، یانزدەهـ، دوانز دەهـDuanz dah ، سێز دەهـ،

چار دەهـ، پانز دەهـ، شانز دەهـ، هەفت دەهـ، هەشت دەهـ، نونزدەهـ، بیست .

---

بیست و یەک، بیست و دو، بیست و سێ، بیست و چار، بیست و پێنج،

بیست و شەش، بیست و هەفت، بیست و هەشت، بیست و نەهـ، سیSe ،

چلCehl ، پەنجاpengiah ، شێست، هەفتیAhfté ، هەشتێ، نودNud ،

Sad سەد، سەد و یەکSad u iek ، دو سەد، هەزار Ahzár .

سەرنج

"وU" ی دەنگدار بە ئامرازی پێوەندی دەکەوێتە نێوان دوو بەشی ژمارەیەک :

بیست"و"یەک .

" یەک "لەگەڵ ناودا وەدوودەکەوێت و نەرم دەگوترێت ekـەک /ـێک :

ئەسپ -ئەسپێک، سەعات -سەعاتێک .

# گەردان

## گەردانی ئامرازی تەعریف

[ گارزۆنی ئەو ناونیشانەی سەردێری وەها نووسیوە و، ئامرازیتەعریفی ئیتالی( وەک theی ئینگلیسی یا "الـ" یعارەبی) بە ئامرازی پێوەندیی ئیزافەی کوردی وەرگێڕاوە، بەنموونە بە " یا " ی " یا من " = هی من ! ] .

گەردانی ئامراز لە کوردیدا [ بەرانبەر شەش دۆخی ئامرازی تەعریفی ئیتالی] بە تاک و کۆ بریتین لە : " ی، ئی"؛ " ئەژ، یا"؛ " ا، ئا"؛" ی، ئی"؛ " یا"؛ " ئەژ". بە وێنە : " یا من"( هی من)؛ " یەک ئەژ ئونگو چێکێر"( یەکێک لە ئێوە چێکرد، کردی).

تێبینی : " ئا"ی داتیڤ لە گەڵ ناوی ئابستراکت وەلادەچێت و بە " ان " ێک وە دوو ناوەکە دەکەوێت، بەنموونە : ئەز بـچووم کەوان az b,çúm k̄aván (مەبەست چوونە راوەکەو) [ گارزۆنی لە مانالێدانەوەی ئیتالییەکەشیدا " کەوان" هەر بە شێوەی کۆ دەڵێت pernici، نەک"کەو"ی تاکpernice، بەڵام بە بیریدا نەهاتووەکە دەکرێت " کەوان"ی کوردیش هەر زۆری کەو بێت ]؛ نموونەیەکی تر : ئەز بـچووم پەزان pažán، بە کوردی واتا : من دەچم بۆ(لای) مەڕە کێوییەکانpecore selvatiche [دەبێت وایان بەو مەڕە دووگدارانەی ئێمە گوتبێت؟] . وێنەیەکی تر لە دۆخی ئابلاتیڤ: " ئەڤ شۆغۆل مێران، لاوان، زەنان" ، واتا : ئەمە کاری پیاوان، جەوانان، ژنانە. ئەو"ان"ـە لەجیاتی"اان !" چونکە دوو پیتی بزوێن بە دوو یەکەوە لە ناوێکدا دەبنە یەک

[ مەبەست : یەکیان بۆ" کۆ"یە و ئەوەکەی تر بۆ دۆخی ئابلاتیف - بەڵام هەموو قسەکە هەڵەیە، چونکە ئەوە هەر ئابلاتیف نیە ] .

کۆتایی ناو و ئاوەڵناو لە کوردیدا لە دۆخە جیاوازەکاندا گۆڕانی بەسەر نایەت : باب(باوک)، یا باب، ئا باب، ئۆ باب، ئیژ باب؛ " باب " هەر وەکوخۆی دەمێنێتەوە.

تێبینی : ناو و ئاوەڵناو لە کوردیدا، ئەگەر بە پیتیدەنگدار کۆتایی بێت، دەکرێت ئەو دوا پیتە دەنگدارە نەمێنێت، نموونە : ئەز ساخە( من ساغم) و دەکرێت بڵێیت : ئەز ساخ، ئەو"ـە "یە نەمێنێت . بەڵام ئەگەر ناو بە پیتی بێدەنگ کۆتایی بێت وسیفەتی بەدوودا بێت، یا راناو، یەکێک لە پیتەکانی"ئا،ئێ،ئی" دەکەوێتە نێوانەوە: بابێ منBabemen؛ دایکا من Daikamen؛ وشەیلێکدراو : مالیاڤا Maliavä . قانوونی گشتیی ئەمە بەمجۆرەیە : ئەگەر دوا پیتی وشەکە "ب" بێت، ئەوا " e ێ"ی بەدوودا دێت (بابێ من)، ئەگەر " ف"بێت ئەوا " e ێ "ی بەدوودا دێت، ئەگەر" ک "بێت ئەوا" a ا"ی بە دوودا دێت( دایکا من)، ئەگەر" ل"ی دوای دەنگدار بێت ئەوا " i ی، ئی "بەدوودا دێت[ مالی من ؟!] و ئەگەر دوای پیتی بێدەنگ بێت ئەوا " ێ " دێت، لە دوای م " ێ" دێت؛ لە دوای ر" ێ " دێت، بەڵام " ر"یەکە کەمێک وەک ئەوەیە دووجار" ر" بێت . بەڵام لە پێناوی قافیەی دێری شیعردا دەکرێت هەر پیتێکی دەنگدار بەکاربێت و، تەنانەت پیتێکی دەنگداری زێدەشی پێوە بلکێندرێت .

[ تەبیعی سەرتاسەر خەیاڵی گارزۆنی خۆیەتی و فڕی بەسەر زمانیکوردییەوە نیە، من لە پێشەکییەمدا باسم کردووە . گارزۆنی پتر لە هەژدە ساڵ لە بادینان بووە و بەشی

ئەوەندە لە کوردییەکەیان فێر نەبووە کە بزانێت"ێ"ی" بابێ من" بۆ ئیزافەی نێرینەیە و "ا" ی" دایکا من" بۆ مێیینە. دەڵێن : برایێ من، جیرانێ من( ئەگەر هاوسێکە نێر بێت)، خوشکا من، جیرانا من( ئەگەر هاوسێکە مێ بێت)، کەکێ من (کاکی من)، مالا من (ماڵی من)، جلێ من(جلی من)،زمانێکوردی، بەڵام : رێزمانا کوردی- وەرگێڕ].

پلەکانی بەراورد

ئەوانەش گۆڕینی کۆتایی وشەیان بەسەر نایەت، بەمجۆرەیە کە لەم نموونەیەدا هەیە : سپێی spéi واتا جوان[سپەهی]،" سپێی تەر" واتا جوانتر،" تەر سپێی" واتا جوانترین [ ئەمەی لەکوێ هێناوە ؟!]؛" تەر" وە پاش دووەمەکە دەکەوێت و، وە پێش سێیەمەکە .

ناوی وەپاڵدراو

بۆ ناوی کە وە پاڵ ناوی کەسانێک، مەملەکەتانێک، یا شارانێک بدرێن :

ئەگەر دوا پیتەکەی بێدەنگ بێت،" i ی، ئی " وە دوو دەخرێت : عەجەم واتا ئێران [وڵاتی فارس]،عەجەمی واتا ئێرانی؛ بەغداد واتا بابل، بەغدادی واتا بابلی؛ مۆسول واتا مووسڵ، مۆسولی واتا مووسڵاوی . ئەگەر دوا پیتەکەی دەنگدار بێت ڤی vi ی وەدوو دەخرێت : زاخۆ، زاخۆڤی؛ ئاکرێ، ئاکرێڤی . بەڵام هێندێکجاریش وەکو تورکان " لی"یەکی وە دوو دەخەن : ستەمبول، ستەمبوللی؛ دیاربەکر، دیاربەکرلی؛ بەڵام ئەمەیان تەنیا بۆ شاران دەخوات کە حەز لە ناوی تورکی دەکەن .

راناو

تاک : " ئەز" یا " مەن"،" تو" ،" ئەو " یا " ئەڤی" [ وی/ئەوی/ئەڤی بۆ نێرینە و

وێ/ئەوێ/ئەڤێ بۆ مێیینە] .

کۆ : " ئەم Am "( لەگەڵ کرداری رابردوودووی سادەدا : مە Ma)،

" ئونگۆ Ungho " [ وە]، " وان Vvan " [ ئەو/ وان بەگوێرەی دۆخ و

شوێنی] .

تێبینی " : ئەز " لەگەڵ کرداری رابردووی سادەدا دەبێت بە " مەن Men"،

بە هەمان شێوە " تو "لە گەڵ رابردووی سادەدا دەبێت بە " تە Ta ".

راناوەکانی تر ناگۆڕێن.

دۆخەکانی راناو

| | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| نۆميناتيف : | ئەز / مەن | ئەمam |
| جێناتيف : | یا مەن | یا ماia má |
| داتيف : | ا/ئا مەنa Men | ئا ماa má |
| ئاکووزاتيف : | مەMe | ئەمam |
| ڤۆکاتيف : | ئەز | ئەمam |
| ئابلاتيف : | ئەژ مەنe x̆ men | ئەژ ماEx̆ Má |

[ "ا"ی " دایکا من " چۆن هی " داتیف"ـە ؟ ئەی لە" جێناتیف"دا دەبێت بڵێت " دایکیا

من" ؟ هیچی بەسەر هیچییەوە نیە].

--------

| | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| نۆميناتيڤ : | تو ( لەگەڵ کرداری رابردووی سادە : تەtá) | ئونگۆ |
| جێناتيڤ : | یا تە | یا ئونگۆ |
| داتيڤ : | ا/ئا تە | ا/ئا ئونگۆ |
| ئاكووزاتيڤ : | تە | ئونگۆ |
| ڤۆكاتيڤ : | تو | ئونگۆ |
| ئابلاتيڤ : | ئەژ تە | ئەژ ئونگۆ |

--------

| | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| نۆميناتيڤ : | ئەو /ئەڤاau/ava | ڤانvan |
| جێناتيڤ : | یا ئەو | یا ڤان |
| داتيڤ : | ا/ئا ئەو | ا/ئا ڤان |
| ئاكووزاتيڤ : | ئەو | ڤان |
| ڤۆكاتيڤ : | ئەو | ڤان |
| ئابلاتيڤ : | ئەژ ئەو | ئەژ ڤان |

--------

[ گارزۆنی لێرەدا بە تەواوی سەری لێ شێواوە، لە بەرانبەرە ئیتالییەکەی ئەمانەدا دەنووسێت... questo, questi, ( کە بە ئینگلیسی دەبن بە (this, these,... . " ئەو، ئەوان" (he,she,it,they,... ) ی لەگەڵ this, these,... "ئەمە، ئەمانە،..."دا لێ تێکەڵ بوون، راناو و ئامرازی ئیشارەتی بۆ جیانەکراونەتەوە ] .

| | تاک | کۆ |
|---|---|---|
| نۆميناتيڤ : | ئەڤی (questo) avi | vvanوان |
| جێناتيڤ : | يا ئەڤی | يا وان |
| داتيڤ : | ا/ئا ئەڤی | ا/ئا وان |
| ئاکووزاتيڤ : | ئەڤی | وان |
| ڤۆکاتيڤ : | ئەڤی | وان |
| ئابلاتيڤ : | ئەژ ئەڤی | ئەژ وان |

تێبینی : هەرچەندە زۆرتر وایە کە ڤۆکاتیڤ[ بانگکردن] بە بێ " ئەی... " [ئەی بابە ... ئەی برا] دەڵێن [ بابە... برا]، بەڵام وا دەبێت دەڵێن : یا باب، یا دایک، یا عەزیز . ia āziz .

## هەمان، هەمان شت

زمانی کوردی ئەوەی نیە . ئـەگـەر کـورد بیەوێت بڵێت : ئـەمـە و ئەوە هـەمان شـتن، دەڵێت : ئەو و ئەڤی یەک . ئەوەی کە لە ئیتالیدا دەڵێین "هەمان من "بە مانای من خۆم، لە کوردیدا لە باسی کەس یا لە ئابستراکتدا " خۆ"دەگوترێت : ئەز بـ -خۆ ( من خۆم )، تو بـ -خۆ، ئەو بـ -خۆ . بۆ "هەر لە خۆیەوە" ش دەڵین : ئەژ خۆ .

تێبینی : ئەم "خۆ"یە زۆر جار بە مانای :هی من، هی تۆ... ئیدی بەکاردێت، بەنموونە: " ئەڤ مەن چێکریا ئەژ عەقەڵێ خو " واتا :" ئەوە من کردوومە، بە زیرەکیی خۆم"، " ئەڤ تە چێکریا ئە ژعەقەڵێ خۆ"؛ یا : ahhk bedén e ẍ kissa Q̈o
" حەق بدەن ئە ژ کیسسا خۆ " " واتا: " پارە لە گیرفانی خۆیان بدەن " .

ئیدی : Idi زۆرتر وادەبێت" ki کی" وەدوودەخرێت " az t,vem iek k'idi ئـەز تـ-ڤێم یەک کـ-یدی" واتا "من یەکی ترم دەوێت"، ئەوە بە ئیتالی دەبێت بە " من یەکێکم دەوێت کە شتی ترە"[ بوختان!]، بەڵام بە مەشقکردنی زمانەکە مرۆڤ فێری دەبێت .

### راناوانی وەرگیراو، ئەوانەی جنسـ(جێندەر، نێر و مێ)یان نیە

ئەو راناوانە کاتێ تەنیا بن کاری ئیزافە دەکەن، دەڵێن :

یا من، یا تە، یا ئەڤی، یا ما، یا ئونگۆ، یا وان.

کاتێک ئەو راناوانە رەگەڵ ناودا بن، " یا "یەکە دەپەڕێت و، شتێک وە دوو ناوەکە دەخرێت، بەمجۆرەی لێدێت: بابێ‌من، بابێ‌تە، بابێ ئەڤی، بابێ مە، بابێ ئونگۆ، بابێ وان .

ئامرازی پێوەندی

کورد، بەوە کە جنس/ جێندەر لە زمانیاندا نیە،" کە "بە ئامرازی‌پێوەندی بەکاردەهێنن: " شۆغۆل کە تو چێ‌تکی " واتا ئەو کارەی کە تۆ دەیکەیت، ئەو زەن کە چۆ [ چوو]، بەڵام کاتێک" کە "باسی شت بێت، دەڵێن " چێ "یا " چی" : "چی هەیا "؟ ئەڤ چیا ؟ ئەو" ا "یەی پشت"چی"هێزی ناوی‌کرداری هەیە. کی بوو؟ واتا : کێ بوو؟ [گارزۆنی نەیزانیوە ئەو"ا"یە کردارە و،"کە"ی پێوەندی لە"چی"ی پرسیار بۆ جیانەکراوەتەوە] .

کردار

ناوی کردار

مەبەست لەو کردارانەیە کە بە بێ تەواوکردنی کرداری رستە، هەر بە ناو یا ئاوەڵناو پێکدێن، بە نموونە :

ئەز خۆلامێ تە، تو خولامێ مەن، ئەو خولامێ مەن.

ئەم خۆلامی تە، ئونگۆ خۆلامێ مەن، وان خۆلامێ مەن .[مەنMen مەبەست : من].

[" ناوی کردار" مەبەستی لەوەیە کە بە ئینگلیسی پێی‌دەڵێن verbal noun، کە فڕی بەسەر ئەم نموونانەی ئێرەی ئەوەوە نیە ].

وێنەی تری کە کردار تێدا لە ماناکەدایە

ئەز بریندار واتا من بریندارم، تە بریندار، ئەو بریندار .

ئەم بریندار، ئونگۆ بریندار، وان بریندار.

بـەڵام جگە لەوە کە ئـەگەر بە پرسیار لەدووی " کی" یەوە بێت، بـەڵام ئەوسـا دەبێت " ی"یەکە بکرێت بە دوو : یی؛ وەک لەم نموونەیەدا :

ئەز کییە ؟ تو کییە ؟ ئەو کییە ؟ ئەم کییە ؟ ئونگۆ کییە ؟ وان کییە ؟

[ تەبیعی ئەمەش هیچی بە سەر هیچییەوە نیە، ئەو " کییە " هـەمان کییێ ی qui est زمانی فەرەنسییە، دوا بەشەکەی کردارە : ئەزکیمە، تو کیی، ئەو کییە، ئەم/ هون/ ئەو کینە] . بەڵام هێندێک جاریش " هەیە" بۆ کەسی سێیەم بەکاردێت : فلان هەیە ماڵ ؟ واتا فڵانکەس لە ماڵە ؟ وەڵامەکەشی دەبێت بە [ هەر بە ئیتالی la casa ha il tale [ بە حەرفی : ماڵ هەیەتی فڵان = ماڵ فڵانی هەیە، بە کوردی واتا : فڵان لە ماڵە!] .

کرداری کاتی رابردووی بەردەوام : نیە

[هەیە، چۆن نیە ؟ من دکر، تە دکر، ئەو دکر ... ]

کرداری کاتی رابردووی نیزیک

ئەز بوو، تو بوو، ئەو بوو، ئەم بوو، ئونگۆ بوو، وان بوو [!]

تێبینی : سـەرنج بدە دەڵێن " ئەز" نەک مەن، "تو" نەک تە، چونکە کردارەکە بووەتە پاسیڤ وەک لە خوارەوە دەبینین .

## کرداری کاتی رابردووی دوور

کورد ئەمەشیان نیە [ هەیە، چۆن نیە ؟ من کربوو، تە کربوو، ئەو کربوو ...]، هەر رابردووی نیزیک بەکاردەهێنن و" کان" kan یکی تێرادەکەن : ئەز کان بوو، تو کان بوو ... ئیدی، واتا من ببووم /بووبووم، تۆ ببوویت /بووبوویت .

[ گارزۆنی دواتر دەڵێت ئەو" کان" ـە عارەبییە ] .

## کرداری کاتی داهاتوو

ئەز دێبووم az debúm ، تو دێبیت، ئەو/ ئەڤ av دێبیت، ئەم دێبوم، ئونگۆ دیبیت، وان دیبیت [!] [ ئەز دێببم، تو دێببی ...] .

## کرداری فەرمان

دێبیت Debit یا باشتر : Bit [!] .

## مەرجی

بۆ کرداری مەرجیی کاتی رابردوو، هەر ئەوەیە کە یەکێک لە دوو وشە وە پێش کرداری رابردووی نیزیک دەکەوێت : ئەگەر egher و خوزی kužī ، نموونە :

" ئەگەر ئەز بووم " یا " خوزی ئەز بووم " واتا ئەگەر من بوومایە ... بەوجۆرە [!] .

بۆ " چاوگی کردار : " دۆخی کەسی سێیەمی رابردووی نیزیک بەکاردەهێنن [!] .

## کرداری هەبوون [ to have ]

هەر یەک حاڵەتی هەیە و کردارەکە ناگۆڕێت و هەر بە راناو جیادەکرێتەوە، لە هەموو حاڵەتەکانی تری زمانیکوردیدا هەر ناویکردار بەکاردێنن، لەبەرئەوە بوو کە من هەر لە سەرەتاوە باسم کرد [ ئەز خولامێ تە و ئەز بریندار، ئەوە چ کاری بەمە داوە ؟] .

کرداری خەبەریی کاتی ئێستا : ئەز هەیە az aia [!] ، تو هەیە، ئەو/ئەڤ av هەیە، ئەم هەیە، ئونگو هەیە، وان هەیە .

لە رابردووی نیزیک : نەک مەن بوو [ بەرانبەر I have had ی ئینگلیسی!] کە بە ئیتالی واتا : لای من بوو؛ ئەوانی تریش : نەک تە بوو، نەک ئەوی / ئەڤی بوو، نەک مە بوو، نەک ئونگو بوو، نەک وان بوو .

کورد هەمانعیبارەت بۆ کرداری کاتی داهاتوو و کرداری مەرجی بەکاردەهێنن، بەڵام لە چاوگدا " هەیە "دەڵێن، جیاواز لە هەموو کردارەکانی تر کە دۆخی کەسی سێیەمی رابردووی نیزیک بەکاردێت، کە لێرەدا نیە، لەبەرئەوە نابێت گەردانی کردارانی کە دێن بە پێوانەی کردارانی تر بپێورێن [ ئەمە وەرگێرانی حەرفیی ئیتالییەکەیە، کە مەبەستی لە من روون نیە و، هیچ قسەیەکی کوردی بۆ ئەوە بە نموونەیەک نەهێناوە-تەوە] .

## گەردانی کردار

گەردانی کرداری زمانی کوردی، بناغەکەی لەوەی کەسی یەکەمی کرداری خەبەریی کاتی ئێستایە . هەر کرداره لەوەدا بۆ سێ کەس جیادەکرێتەوە و، کەسی دووەم ئەگەر

به راناوەکەی نەبێت لە کەسی‌سێیەم جیاناکرێتەوە . کردار لە دۆخی رابردووی نیزیک یەک شکڵ وەردەگرن، بەڵام رەنگە بێ لەوانەی کە کەسی یەکەم تێدا بە "م"ی بێدەنگ کۆتایی دێت، بەڵام کە ئەوە بۆ دوو کەسەکەی تر نامێنێت . زمانی کوردی، جگە لە کرداری دۆخی " خەبەریی ئێستا " و" رابردووی نیزیک" و" فەرمان"، دۆخێکی تری کرداری نیە، مەگەر رەنگە کرداری " بوون"ی لێ دەرچێت کە دۆخی " داهاتوو" شی هەیە، وەک کە پێشتر باس‌کرا و، وا باشترە ئەوە لە کردارە پاسیڤەکان دابنرێت.

تێگەیشتنی باشتری هەموو ئەمە بە روونکردنەوەی شێوەکانی کردار دەبێت کە لێرەوە دەچمە سەر باس‌کردنیان، دەیانکەم بە سێ سنف : ئاکتیڤی سادە، لێکدراو، پاسیڤ . بە فێربوونی ئەوانە ئیتر تێگەیشتنی زمانی کوردی زەحمەت نابێت . کەواتە، بە گەردانی کرداری ئاکتیڤ دەست پێ‌دەکەم .

## گەردانی سنفی یەکەمی کرداران

## کرداری " کردن "

پێم باش بوو بەو کردارە دەست‌پێ‌بکەم چونکە ئەوە نەک هەر ئەوەیە کە پترین بەکاردێت، ئەوەشە کە کرداری لێکدراوی پێ دروست‌دەکرێت، کە بە تێگەیشتنی ئەوە ئیتر کلیل بۆ تێگەیشتنی زمانی کوردی بەدەستەوە دەبێت . بەڵام با ئاگاداری ئەوە بین کە تاک تێدا لە کۆ جیا نابێتەوە مەگەر بە راناو :

## کاتی ئێستای خەبەری

ئەز چێ کیَم ce Kém یا : کێم kem، تو چێ کێی یا : کێی، ئەو چێ کێت یا : کێت .

ئەم چێکێم cekem یا : کەم kem، ئونگو چێکێی یا : کێی، وان چێکەت یا کەت .

تێبینی : کاتێک ئەم کردارە لە نەرێنی/ نێگاتیڤدا نەبێت، " ب " یا " ت" یەکی تێ ڕادە- کرێت، بەڵام هەر لە کاتی ئێستا و فەرماندا، ئەگەر بخرێتە کاتی ڕابردووەوە دەبێتە قسەیەکی هیچ .

| | |
|---|---|
| ئەز چێبەکەم az cebekem یا چێت کەم | ئەم چێبەکەم یا چێت کەم |
| تو چێبکەی tu cebkei یا چێت کێی cet kéi | ئونگو چێبکەی یا چێت کەی |
| ئەو چێبکەت یا چێت کەت | وان چێبکەت یا چێت کەت |

سەرنج : ئامرازی" چێ " لە وشەی لێکدراودا - وەک دواتر لە شوێنی خۆیدا دەبینین - نامێنێت، بەڵام بەهەرحاڵ لە کرداری کاتی ئێستادا بەدەگمەن وادەبێت نەمێنێت .

[ دەبێت گارزۆنی ئەو" چێ"یە بە یەکێک لە بەکارهێنانە جیاوازە زۆرەکانی" چیciی" ئیتالیی بەبیردا هاتبێت؟! ئەگەر لە ئیتالییەوە وەربگێڕین، ئەوا " ئێ" و" چێ " وەکو یەک هەر دەبن بە " هەیە"، لە کرداری بوون essere ؛ لەم بەشەی بەکارهێنانیدا دەبێتە هەمان سێ c'est ی فەرەنسی، دوورنیە گارزۆنی" کردن" و" چێکردن"ی کوردییەکەش بە شتێکی لەو بابەتە تێگەیشتبێت – وەرگێڕ] .

## کاتی ڕابردووی بەردەوام

کورد، بۆ کاتی ڕابردووی بەردەوامی کە نییانە، وشەی عارەبیی" کان kan " بەکار-

دێنن، دەیخەنە پێش راناو لەگەڵ کرداری خەبەریی کاتی ئێستادا :

کان ئەز چێ‌بەکەم، کان تو چێ‌بکەی، کان ئەو چێ‌بکەت. [من دکر، تە دکر ...] .

کان ئەم چێ‌بەکەم، کان ئونگو چێ‌بکەی، کان وان چێبکەت .

کاتی رابردووی نیزیک

مەن چێ‌کریە Men cekiria یا چێ‌کێرcekér، تە چێ‌کریە ta cekiria

یا چێ‌کەرceker ، ئەو/ئەڤ چێ‌کریە av cekiria یا چێ‌کێر cekér .

ئەم چێ‌کریە یا چێ‌کێر، ئونگو چێکریە یا چێ‌کێر، وان چێ‌کریە یا چێکێر.

کاتی رابردووی دوور

زمانی کوردی ئەمەشی نیە [ هەیە، چۆن نیە ؟ من چێ‌کربوو، تە چێ‌کربوو... ]، ئیتر لەجیاتی ئەوە، هەر"کان" دەخەنە پێش کاتی رابردووی نیزیک :

کان من چێ‌کریە، کان تە چێکریە، کان ئەڤ/ئەو چیکریە.

کان ئەم چێکریە، کان ئونگو چێکریە، کان وان چێکریە.

کاتی داهاتوو

کورد کرداری کاتی داهاتوویان نیە، هەر کاتی ئێستای خەبەری بەکاردەهێنن و، لە ماناکەی یا لە ئاوەڵناوێکەوە مەبەست دەزانرێت، نموونە : ئەگەر ئەز چێبەکەم، وەکو ئەوەیە بە حەرفی بڵێین " ئەگەر دەکەم " بەڵام دیارە مەبەستەکە باسی داهاتووە .

[ پێشتر گوتی هەیە : ئەز دێبووم az debúm... ئیدی . "چێ‌بکەم " بە بێ ئەگەریش کرداری مەرجییە، کاتی‌ئێستای‌خەبەری نیە، گارزۆنی تەنانەت ئەوەشی نەزانیوە ] .

فەرمان

داڕشتنی فەرمان هاسانە، دوا سیلاب(بڕگە)ی کرداری کاتی ئێستای خەبەری بۆ ئەوە دەکرێت بە " a ا" : Cebka چێبکا /بکە، Cetka چێتکا /تکە.

تێبینی : لەو داڕشتنەی فەرمان بە گشتی بەوشێوەیە، بە گۆڕینی دوا بڕگەی کردارەکە بە "a ا"، ئەگەر کرداری تەنیا یەک سیلاب لە کرداری لێکدراو لاببرێت، ناچار هەر کردارەکەی کاتی ئێستای خەبەری بۆ فەرمان دەمێنێتەوە : ئەزێم واتا دێم و، جوانتر : ئەز بـێم، ئەز تـێم، تو تـێت؛ تو بـێی، تو تـێی؛ ئەو بـێت، ئەو تـێت . بەڵام لە " کۆ"دا هێندێک جار دوا پیتی بێدەنگ دەکەن بە" ن "، نموونە : تـێن، بەڵام تەنیا لە فەرمان یا لە ئابستراکتدا.

سەرنج بدە : نابێت vora و arra [ وەرە و هەڕە]ت لە گەرداندا لێ بشێوێن، ئەو دوو وشەیەی کە هەمیشە لە دەمی کورد دەردەچێت و لە هەر لەحزەیەکدا بە کەسێکی دەڵێن : وەرە، هەڕە، بەڵام هەر لە ئەرێنیدا . لە نەرێنیدا دەچنەوە سەر کردارەکە : " نە ئێی " واتا مەیە، " نە چیا " واتا مەچۆ .

کرداری مەرجی

کورد کرداری مەرجییان نیە . لەجیاتی ئەوە، دوو ئاوەڵکرداری " ئەگەر egher" و " خوزی kuži " بەکاردەهێنن [ ئاوەڵکردار؟!].

یەکەمیان بۆ کرداریکاتی ئێستا و رابردووی بەردەوام، کە ئەو دووانە لای ئەوان لێک جیا ناکرێنەوە و، بۆ کاتی رابردووی نیزیکیش .

دووەمەکەیان بۆ رابردووی دوور، وەک دەبینین :

ئەگەر ئەز چێبەکەم، ئەگەر تو چێبکێی، ئەگەر ئەو چێبکەت .

ئەگەر ئەم چێبەکەم، ئەگەر ئونگۆ چێبکێت، ئەگەر وان چێبکەت .

رابردووی نیزیک

ئەگەر مەن چێکریا، ئەگەر تە چێکریا، ئەگەر ئەو چێکریا .

ئەگەر ئەم چێکریا، ئەگەر ئونگۆ چێکریا، ئەگەر وان چێکریا .

رابردووی دوور

خوزی مەن چێکریا، خوزی تە چێکریا، خوزی ئەو چێکریا .

خوزی ئەم چێکریا، خوزی ئەنگۆ چێکریا، خوزی وان چێکریا .

کاتێک رابردووی دوور مەرجی بێت، وشەی عارەبیی " کان "ی بۆ بەکاردەهێنن :

کان ئەو مەن چێکریا ئەگەر ... کە دەبێت ئاگامان لە عیبارەتەکە بێت کە کورد

زۆرتر ناوی ئاکوزاتیف (مفعول) دەخەنە پێش کردار.

بۆ کاتی داهاتوو، مەرجییان نیە، رابردووی نیزیک بەکاردێنن.

چاوگ و سوپینۆ

[supinum یلاتین،وەک ئەوە کە لە کوردیدا چاوگ بە"ن" کۆتاییدێت:" هاتن"... ]

بۆ چاوگ، زمانی کوردی کەسی سێیەمی رابرووی نیزیک بۆ کرداری سادە بەکار-

دەهێنێت : " هندا چێکریا " واتا " ئەوەندە کردن" [مەبەست : زمانی کوردی وشەی

چێکرن، کردن ی نیە ! ] .

[ من لێره گەیشتوومەته کۆتایی لاپەڕه ٣٣ی کتێبەکەی گارزۆنی، دەبینم ئەم فەسڵەی باسی سەیری کردار تێدا بەمجۆره تا لاپەڕه ٤٨ درێژەی هەیە، کە من هیچ کەڵکێک لە تەواوکردنی وەرگێڕانیدا نابینم . پێم وایە هەر ئەوەندەی کە تا ئێرەی لێم وەرگێڕاوە، بە مشتێکی نموونەی خەڵوارێک لێ ئاگادار بین رەنگە بەس بێت . ئیتر واز لە پازده لاپەڕەی داهاتووی دەهێنم و دەچمە لاپەڕه ٤٩ - وەرگێڕ] .

ئامرازی پێوەندی و ئاوەڵکردار

[ گارزۆنی لێرەوە چەند لیستێکی وشه و زاراوەی ئیتالی و بەرانبەرەکەیان بە کوردی دەدات . من وشه ئیتالییەکان دەکەم بە ئینگلیسی و کوردییەکەی گارزۆنی بە هەمان لاتینەکەی خۆی لا دەنووسم]

| [ کوردییەکەی گارزۆنی] | [ مانای وشه ئیتالییەکە بە ئینگلیسی ] |
| --- | --- |
| Nesif, Ben | Below, down |
| Bess, Bessa | Enough |
| P,kást | At beautiful post |
| Ex̆ q̃o,Tavék allah | Accidentally,without having given occasion |
| Ḡhaflét | Accidentalyy, suddenly |

| | |
|---|---|
| Now | Nuk, Vegháve |
| So that, in order that, or similar | Katera |
| Ahi | Ahi |
| Otherwise, if not | Egher ná |
| Otherwise, that is in another way | Gheir rengh |
| Also | Am |
| Yet | Ehz |
| Openly | Eskara |
| Just, hardly | Tene |
| Near | Nek |
| Very, very much | Ghalek, Káuvi |
| In Front, Forward | Ber, Ber aika |
| Although | Belà |
| Good | Kangia |
| Briefly, *that is* in one word, for soon | Jék kabar, Zu, beléz |
| Clearly | Kefsa |
| Certainly | Málúm, Be sck |
| That is | Iani |

| | |
|---|---|
| As, in what way | Ciáva |
| As, compared | Sibi, tamét |
| Comfortably, easily | Be zahhmi |
| Comfortably*, that is* to do with his convenience Ahmda q̈o | |
| with | Ghel |
| So | Enda, Aurengh,Vasána |
| So, optative | Kvží |
| From, article | Eẍ |
| By,adverb,*that is to say* near | Nek |
| In front, Before | Ber, Ber aika |
| From which, Since | Pasi |
| From behind, on the opposite side, back | Pisct |
| Long since | Eẍ zamán, smésia |
| From now on | Eẍ era péva, ex nuk péva |
| Since then | Pasi, eẍ péva |
| Inside | zior |
| Behind, after | pasi |

On the opposite side,(*corr.also*:after,back,behind)Pisct

| | |
|---|---|
| To follow one | Du |
| Over there | Lerva, au vialì |
| This way | Erva |
| Here and there | Erva lerva |
| Scattered here and there | Belάva |
| Up,Upstairs | Ser |
| Below | Nesif |
| After | Pasi |
| Where | Kiva |
| Where is | Kane |
| Evereywhere | Ammo ard |
| Therefore (i.e. need) | Lazem |
| or they say: If it is so necessary | Egher au rengh lazem |
| Here( French: voici) | A A |
| And | U |
| Finally, in the end | Du maia, Pasi |
| Finally ( expectation act) | Scuker q̈odé |
| *They say* : Thanks God | Alahhmd'allah |

| | |
|---|---|
| Till | Ahhtta |
| Till now | Ahhtta nuk |
| As long | Ahhtta |
| Perhaps | Belki |
| Between | Bein ( pronounced one syllable) |
| Between, i.e. middle | Beiná |
| Out | Derva |
| Trouble | Vveh |
| In | Nek, Dangh |
| Back, Behind | Pasi |
| Untill | Ahhtta |
| In short | Beléz |
| Down | Nesif |
| There | Orva |
| Further on, later on | Orvétera |
| Here | Erva |
| More in here | Ervétera |
| Together | Pequa, Barabár |

| | |
|---|---|
| In vain | Be faida, Batál |
| Instead | Sciúna |
| Therein | Era |
| There | Lue |
| Liberally, i.d. without giving awe | Be kaida |
| Liberally, without flush | Be sciérma |
| Ma | Amma |
| Never | Ciúgiár |
| Less | Kima |
| A lot of | Ghelek |
| Neither (Ita. ne!)(né?) | Na |
| Necessarily | K̄ati lazem |
| Nothing | Ciú nina, Kvt |
| Not | Na, Nina |
| Or (separative particle) | Ia |
| Ouch (Ohi) | Ahi |
| Oboe | Lá lá |
| Further | Sbél, Gheir |

| So that | Eẍ av |
| --- | --- |
| Now | Nuk, veḡháve |
| Where (adv.) | Kiva |
| Where, (disapproval with admiration) | Iva Kiva |
| Everywhere | Ammo ard |
| For | Bu |
| (sometimes used in the junctions) | Pv |
| (when it means reason, cause) | Katera |
| On the other hand, for more | Laken, Mà |
| Why | Boccia, Boc̈ |
| For now | Nuk, Veḡháve |
| More (quantity) | Ehz, Zeida, Peter |
| ( comparison) | Ter ( but as suffix to adjective) |
| Rather, to b ebetter | Ceter, Quóscter |
| Little (quantity) | Piciak, Endúska |
| (i.e.) lacking | Kima |
| Then | Pasi |
| Since, As | Pasi ke |

| | |
|---|---|
| Soon | Zú, Beléz |
| Here | Era, Venáve |
| Which, As (comparison) | Ciáva |
| Which (interrogative) | Ki |
| Any, Whatever | Ehr kibít ( a phrase means : everybody that will be) |
| when | Kanghi |
| How much | Cián (monosyllable) |
| Although | Belá |
| Almost, just | Tene |
| Here | Era |
| If | Egher |
| Always,(*corr.also*:always,every,ehatever) | Ehr, Daiman |
| Without | Be |
| Forcedly | Koték |
| Yes | Aré |
| ( speaking sivilly) | Belli |
| Till | Ahhtta |

| | |
|---|---|
| Untill when | Ahhtta Kanghi |
| Only | Bes, Tene |
| Above | Ser |
| Under, at bottom | Ben |
| Below, down | Nesif |
| Immediately | Zu |
| So and so (unnamed person) | Flán |
| Such (adverb) | Sibi, Tamét, Ciáva |
| (so)Much | Enda |
| Late | Drengha |
| Between | Bei,n (monosyllable) |
| Veh | Vveh, vvehi |
| Willingly | Ex̌ Del ( i.d.) from the heart) |
| From the heart | Ser sereq̈o (a kurdish phrase, lit. : on oneself's head) |

کاتەکان

| | |
|---|---|
| Year | Sali |
| Month | Mah, Aíf |
| Week | Ahftie |
| Day | Rvz |
| Hour | Sāat |
| Half an hour | Nif sāat |
| A quarter of an hour | Ciáhrék |
| Three quarters of an hour | Séh ciáhrék |
| Moment | Dakek̄ |
| One moment | Iek Dakek̄ |

بەشەکانی رۆژ

| | |
|---|---|
| Dawn | Spéda |
| Morning | Sabahh |
| Midday | Ni,vro , I,vro |
| Vespers | Ivári |
| Sunset | Anghori |
| One hour at night | Ǣsca |

| | |
|---|---|
| Night | Sciéf |
| Midnight | Nif Sciéf |

## ساڵەکان

| | |
|---|---|
| Leap year | Sáli Kabisa |
| This year | Au sáli |
| Last year | Par |
| Two years ago | Perár |
| Three years ago | Peter perár |
| Four years ago | Ciáhr sáli bù . |

ئیتر دوای ئەوە بەوجۆرە دەڕوات، ژمارەیەک هەمیشە پێشدەکەوێت .

| | |
|---|---|
| The coming year | Sáli k'idí(واتا ساڵێکی تر) |

## ڕۆژەکان

Auro, Dui, Per, Pétera per, Ciáhr rvz ber ئەمڕۆ، دوێنێ، پێرێ، بەسرپێرێ، بەر لە چوار ڕۆژ( ئیتر لێرەش وەکو ساڵەکان ژمارە بەکاردێن) :

Sobahh, Dv Sobahh, Seh sobahh, Ciáhr sobahh, Pasi penc rvz

سبە، دووسبە، سێسبە، چوارسبە، پاشی پێنج ڕۆژ.

## رۆژەکانی حەفتە

بۆ رۆژەکانی حەفتە " شـەممە" دەکرێتە بنـاغە و: یەکەم شەممە، دووەم شەممە، سێیەم شەممە، چوارەم شەممە، پێنجەم شەممە، رۆژی هەینی ناوی تایبەتی خۆی هەیە :

Sciámbi, Iek Sciámbi, Du Sciámbi,Seh Sciámbi,Ciáhr Sciámbi, Penč Sciámbi, Inni.

ئـەم رۆژەی دوایـی بۆ مسـوڵمانان وەکـو یـەکشـەممـەیـە بۆ مـەسیحییان، پێشـیدەڵێـن Gemmā[جمعە]، واتا یەکێتی/ وێکڕابوون، چونکە نیوەڕۆ لەسەریان واجبە( ئـەگەر عوزرێکی شەرعی نەبێت) کۆببنەوە و پێکەوە بە رەسمی نوێژ لە مزگەوت بکەن .

## مانگەکان

Adár, Nisán, Ghulán, K̅azirán, Tirma, Tabák̅, Ilún, Ciria, Ciria pasi, Kanún picúk, Kanún mazén, Scuàt.

ئادار، نیسان- ئاپریل،گولان- مایس، خازیران[حەزیران]، تیرما- تەمووز، تاباخ- ئاب، ئیلوون - سێپتامبر،چریا - ئۆکتۆبر، چریا پاشی - نوامبر، کانوونپچووک - دیسامبر، کانوونمەزن - جانڤیە، شوات[ شوبات].

## چوار وەرزەکان

Bahr, Avíni, País, Zevestán.

چوار عونسورەکان

Ard, Ave, Ahuva, Agher/Aghri.

ئاسمان

Asman, Stéra, Ataf, Aif, Rvz ghairit, Aif ghairit.

ئاسمان، ئەستێرە، هەتاو، هەیڤ[مانگ]، رۆژ گیران، هەیڤ گیران .

لە حاڵی هەوا

Gherma; sara/ Sarmia; Avra; Sáii/ Safi; bà; Babelisk;
Brusi; Denk a,ura; Barán; Bafer; Terk.

گەرما، سەرما، هەور، سایی، سافی، با، بابلیسک[گێژەڵووکە]، برووسکە، دەنگیهەور، باران، بەفر، تەرزە.

لەشی مرۆڤ

[لێرەدا کوردییەکەی گارزۆنی بە شێوەی خۆی دەنووسمەوە و ئیتالییەکەی بەرانبەری هەرچی بێت وەردەگێڕم] :

| | |
|---|---|
| Meróvi, mér | مرۆڤ، مێرد |
| Zen | ژن |

| | |
|---|---|
| Suréta, scekel | شكڵ |
| Ru | دەموچاو |
| Ser | سەر( بە "ـە"یەکی نەرم!) |
| Perciá | پرچ، قژ |
| Mu | موو |
| Genik | ناوچەوان! |
| Beró | برۆ* |
| Mežulánk | پیلو* |
| Cia,v | چاو |
| Bibi | بیبیلە |
| Defn | لووت |

---

[ *نووسیویە ciglio چیلیۆ کە بە برژانگ دەڵێن، ناوی برۆ بە ئیتالی sopracciglio سۆپراچیلیۆ، کە دەکاتە : سەر یا سەرووبرژانگ، بـەڵام رەنگە بۆ کورتکرانەوە بە برۆش گوترابێت، لە وشەنامەکەشیدا وەکو ئێرە هەر چیلیۆ هەیە و ئاوا بە " بەرۆ"ی مانا لێداوەتەوە . جگەلەوە، سۆپراچیلیۆ یا مژانگ (برژانگ بە شێوازی بادینان) لە کتێبەکەدا نیە ... ئـەگەر مەبەستی لە Mežulánk مژانگ نەبێت و بە هەڵە وای-زانیبێت بە پیلو دەڵێن، کە لە بادینان هەر پێیدەڵێن پێلوو- وەرگێڕ] .

| | |
|---|---|
| Dé,v | دەم |
| Le,v | لێو |
| Arzénk | چەناگە |
| Dedán | ددان |
| Pu dedán | پووک |
| Afk, afka | تێکڕای ددانەکانی سەروو یا خوار( بە ئینگلیسی: jaw) |
| Ažmán | زمان |
| Re | ریش، ردێن |
| Simbél | سمێل |
| Ghoh | گوێ |
| Gherú | گەروو |
| Sto | مل، ئەستۆ |
| Bask | باسک |
| Anísk | ئانیشک |
| Dest | دەست |
| Bohst | لەپ(ی دەست)! |
| T,pel | قامک! |
| Ghre T,pel | جومگەی قامک! |

| | |
|---|---|
| Néinúk | نینۆک |
| Mel | شان! |
| Pist | پشت |
| Ciciék | مەمک |
| Sink | سینگ |
| Māde | مەعیدە |
| Parasú | پەراسوو |
| Tanést | کەمەر |
| Nafka | ناوک |
| Zik | زگ |
| Reve | بەرگەدە، شوێنی تووکی بەر |
| K̄amak̄a | (ئیتالییەکە : وشەیەکی نارەسمی بۆ هەرتک : ) سمت، کوڵم |
| Avkvǐzin | چاڵی نێوان ران و زگ |
| Kodk | چۆک |
| Lulia pe, Bask pe | لاق! |
| Klil pe, Ghazék | گوێزینگ |
| Pé | پێ |
| Cierma | پێست، چەرم |

| | |
|---|---|
| Bezn, Bezna | بەژن |

## ناوەوەی لەش

| | |
|---|---|
| Astìi | ئێسک |
| Mežzi | مێشک |
| Péi | عەسەب، دەمار |
| Rē | رەگ |
| Rē spì | شادەمار! |
| Kuhhn | خوێن |
| Del | دڵ |
| Melák | جەرگ! |
| Melák spí | سي! |
| Zehr ave | زەرداو |
| Ťahhel | سپڵ |
| Rivi | ریخۆڵە |
| Male piciúk | (منداڵدان)رەحم |
| Papfk | میزڵدان |
| Ghu | گوو |

| | |
|---|---|
| Miz | میز |
| Nafža | مەچەک |

خێزان و خزم و خوێش

| | |
|---|---|
| Bab | باب |
| Zr bab | زڕباب |
| Bab pír | باپیر، باوەگەورە |
| Bab, ba pir | بابی باپیر |
| Dáik, Dáika | دایک |
| Zen bab | باوەژن |
| Da píra | داپیر، نەنک |
| Dáika da píra | دایکی داپیر، دایکی نەنک |
| Kvrv | کوڕ |
| Kéccia | کچ |
| Nevi | نەوە |
| Brá | برا |
| Kusk | خوشک |
| Mām | مام |

| | |
|---|---|
| K̄ali | خاڵ |
| Meta | خوشکی باوک |
| K̄aléta | خوشکی دایک |
| Brá za | برازا |
| Kvár zá | خوارزا |
| Bismán | پسمام(وشە ئیتالییەکە خاڵۆزاش دەگرێتەوە) |
| Dotmán | دۆتمام(وشە ئیتالییەکە خاڵۆزاش دەگرێتەوە) |
| Kasú | خەزوور![خەسوو و خەزوور لە ئیتالیدا هەر دوا پیتیان جیاوازە] |
| Zen mām | خەسوو!، ژنی مام/ ژنی خاڵ(زاراوەیەکە بۆ رێزلێنان) |
| Zavá | مێردی کچ |
| Buka | ژنی کوڕ |

تێبینی: یەک وشە بۆ هەموو ئەو پێوەندییانەی مام/خاڵ/ پوور لە کوردیدا نیە [ لە ئیتالیدا یـەک تاقە وشـە بۆ تێکڕایـی مامان و خاڵان و ژنەکانیان و پوورانیش هـەیـە ] . کـورد دەڵێن: مێردی پوورم، ژنی مامم . "مێر مەتا" واتا مێردی خوشکی بابم ." مێر خالەتا " واتا مێردی خوشکی دایکم ." زەن مام " واتا ژنی مام، " زەن خاڵ" واتا ژنی خاڵ . بە هەمان شێوە :"مێر خوشك" واتا مێردی خوشك،" زەن برا" واتا ژنی برا،" Ti تی" واتا برای مێرد یا برای ژن . مسوڵمان پتر لە ژنێک دەهێنن، ئەو ژنانە دەبنە Avi,Avála بۆ یەکتر[ هەوێ]، واتا هـەڤاڵ . بـەڵام کەسێکی دەرەوە بەوانە دەڵێت : ژنی یەکەم یا

دووەمـی فلان، یا ئـەگەر منداڵیان هـەبن پێیان‌دەڵێن دایکی فلان . " Mer" واتا مێـرد، " Zen " واتا ژن .

تێبینی : لە هەموو رۆژهەڵات، پیاو لە قسەکردنیدا زۆر بە شەرم باسی ژنەکەی دەکات. لەجیاتی‌ئەوە بڵێت ژنەکەم یا ناوی ژنەکەی بهێنێت، ئەگەر ئەولادی‌هەبن، دەڵێت دایکی فلان، ناوی ئەولادی دەبات، ناوی کوڕی . ئـەگەر ئـەولادیشی نـەبن، دەڵێت " ماڵم " .

ئەگەر رووی قسەی لە دۆستێکی نیزیکی بێت، دەڵێت : خوشکت . ژنەکانیش بە هەمان نەزم، لە باسی مێردیاندا ئەگەر منداڵیان هەبن دەڵێن : باوکی فلان، ناوی ئەولاد دەهێنن (هەمیشە ناوی یەکەم کوڕ)، ئەگەر ئەولادیشیان نەبن دەڵێن : ئاغای ماڵ . بـەڵام ئەگەر کوڕیان نەبن و، هەر کچیان هەبن، نـابێت ناوی کچەکەیان بهێنن، بە بێ ناوهێنان هـەر دەڵێن : باوکی کچەکەم، دایکی کچەکەم .

کەسانێکی هەمان بنەماڵە پێیان دەگوترێت : وەجاخ Ugiák .

کەسانێکی لە نەژادی محەممەد پێیان دەگوترێت : شەریف، یا : سەید .

کەسـانێکی لە نـەژادی میران یا وەزیـران، پێیان دەگوتـرێت Bek zadá بـەک زادە، Ugiák zadá وەجاخ زادە .

## مەراسیم و سڵاوی کورد

Sabahh'I ker سەباح لخێر واتا بەیانی باش، نیڤرۆ لخێر واتا نیوەڕۆ باش، ئیڤاری لخێر واتا ئێوارە باش، لە رۆژئاوابوونەوە تا کاتی‌خەوAnghori bel ker :ئانگۆری

بیل خێر.

چاک وچۆنی

کەیفاتە چاوا؟،Ahhle tá حالێ تە ؟ وەڵام: Kangia قەنجە، تو چاوا؟ ئەلحەم دەڵلاهـ قەنجە Alahhm d’allah kangia ، شوکورخودێ Scuker Ŏodé قـەنجە . خێر هاتی . سەر سەرێ مەن هات، سەر چاڤێ مەن هات و، ئـەم دوو قسەی دواییە دەکرێت بە بێ " هات"ـەکەش بڵێن، هەر : سەر سەرێ مەن، سەر چاڤێ مەن . کاتێک کەسێکی پلەی خـوارتـر لە سـەفـەرێک یا لە کـارێـک دێتـەوە، سـەرەتـا پێیدەڵێن بەخێرهاتـی و ئەوجا : Tu sciakiát تو شـەکەت، واتا تۆماندوویت. وەڵامیئەوش سـوپاسدەبێت بۆ خودا کە باشم و، بێوچان شتێک لە قسەی چاکەخوازی .

تکاکاریی باشی

خودێ شوغلێتە راست ئینیت، خودێ بێلیت کورو تە، خودێ ئەژ تە رازیبیت،خودێ دەولەتاتە مەزن بکێت.

ئەمەش هەر بە کەسی پلەی سەروو دەگوترێت : ئەز قوربانێ تە، ئەز خولامێ تە.

بۆ کاتی رۆیشتن

خاتێرا تە، خاتێرا ئونگو ؛ وەڵامەکەی : ڤەگەرا تە خێر.

بۆ کەسێک دیارییەکی هێنابێت، لەوێ نـانـی خـواردبێت، یا هەر چاکەیەکی تر لەکاردا بێت : مالی ئاڤا.

بۆ رۆیشتن لە لای میر یا کەسێکی گەورەوە، ئەوەی دەڕوات هەر ملی لار دەکاتەوە و دەستی راستی لەسەر سینگی و ئەوجا سەر ناوچەوانی دادەنێت بێ ئەوە کە هیچ بڵێت، یا یەک یا دوو شتی چاکەخوازی دەڵێت .

مەراسیمی سەرەخۆشی

کاتێک کەسێک دەمرێت :

لای کوردان و لە وڵاتانی دەوروبەریان وەهایە، کاتێک کەسێک لەماڵێک دەمرێت، خەڵکی ئەو ماڵە سێ رۆژ لە ماڵ دەرناچن، پێشوازی لە دۆست و ئاشنایانیان دەکەن کە بۆ پرسە روو لە ماڵیان دەکەن B,ciúm Tahhzí : بچووم تازی [ لە خوێندنەوەی ئیتالیدا ئەو پیتەی"i" لە"B,ciúm" دا هەروەکو نەبێت وەهایە، ئەوە لە نووسینی وشەی کوردی لە زۆر شوێنی ئەم کتێبەدا هەیە ].

ئەوەی بۆ پرسە دەچێت، هەر کە وەژوورکەوت دەڵێت Seretà quosca : سەرێ تە خۆشە، یا ئەگەر بە پتر لە کەسێک بگوترێت : سەرێ ئونگۆ خۆشە.

ئینشاڵڵا تو گەلەک خۆش بیت،Q̈odé kvrvtà b,elit خودێ کوڕوتە بێلیت،واتا خودا حەزکات کوڕەکانت بژین . لە کاتی رۆیشتنیشدا دەڵێت : رەحمەت بیت . خەما نە هەلگرە، ئەمرا خودێ .

خەما نە هەلگرە ammo ruzeq̈o b,merum هەموو رۆژێخۆ بمەروم، خودێ دل تە خۆش کەت . وەڵام : خودێ تە پاریسیت.

خودێ زێیده (مەبەست لە ساڵانە) درێژ کەت(ژیانت) . هەزار سالی بیت .

خودێ شوغلێ تە راست ئینیت.

زاراوەی پاڕانەوە

خاترا خودێ . خاترا پێغەمبەر . خاترا سەرێتە . خاترا سەر بابێتە . خاترا سەرکوڕو تە . خاترا رێ ئێتە (خاتری ردێن / ریشی تۆ) . عەشقا خودێ .

لای مەسیحییەکان ئەمانەش هەن :

خاترا عیسا، خاترا مەریەم، خاترا ئینجیل.

لای جووەکان

خاترا مووسا . خاترا تۆرات.

لە کاتی پەرێشانیدا : ئەمان، دەخیل . هاوارا خودێ .

سوێند

خودێ . پێغەمبەر. Mahhumet محەمەد . مەساف[مسحەف]، قورئان . سەرێ تە . سەرێ مەن. سەر کوڕو تە . سەر بابێتە . سەر کوڕو مەن . سەر بابێمەن .

ئەمانەش لای مەسیحییەکان :

ئینجیل . عیسا . مەریەم .

جووەکان :

مووسا، تۆرات.

ئەوانە هەموو بە شێوەی ئابستراکت وەهان، بەڵام بۆ قسەیەکیش دەگوترێت ئەو شتە : بە خودێ Pv Qodé، بە ئەو گراری ( واتا بە ئەم خوراکە)، بە ئەو نان .
هێندێک کەسیش وادەبێت بە عیبارەتی عارەبی خەستی دەکەنەوە : وەڵڵا، بیللا، تەڵڵا .
بۆ تێگەیشتنی پێوەندیی عیبارەتەکان و، وەسەرخستنەوەی وشەکانی وشەنامەکە، با سەرنجی تێبینییەکان بدرێت و شێوەی گەردانی پیتە دەنگدارەکان، کە وادەبێت وێ- دەخرێت یا لێ لادەدرێت.

وشەی هەر لە سنووری شتی پێویستتر دا

بۆ سەفەر

| | | |
|---|---|---|
| کاراڤان کەنگی چیت ؟ | واتا : | کاروان کەی دەچێت ؟ |
| بۆشە | | (بە ژمارە) زۆرە |
| ئەورۆ کیڤا گەیت ؟ | | ئەمڕۆ گەیشتە کوێ ؟ |
| بـ رێڤا ترسا هەیە | | بە ڕێگاوە ترس هەیە |
| ئەز تـ ڤێم سواربوم | | دەمەوێت سواری ئەسپ( !)بم |
| ئەز تـ ڤێم پەیابوم | | دەمەوێت لە ئەسپ دابەزم |

| | |
|---|---|
| ئەز تـ ڤێم پەیا چوم بو کێیفا خۆ | دەمەوێت بە پێ بڕۆم بۆ کەیفی خۆم |
| ئەز وەستا | من ماندووم |
| ئەز تـ ڤێم راواستوم، و دەروونوم پیچەک | من دەمەوێت راوەستم و دانیشم کەمێک |
| ئەز تـ ڤێم ڤەخوم | من دەمەوێت بخۆمەوە |
| ئەز تـ ڤێم ئاڤێ | من ئاوم دەوێت |
| ئەز بەرسیا | من برسیمە |
| ئەز تـ ڤێم بخوم | دەمەوێت بخۆم |
| Kahhuna men tet خەحونا مەن تێت | من خەوم دێت |
| ئەز تـ ڤێم بێنەڤوم | من دەمەوێت بنووم |
| ئەز تـ ڤێم دێ رابوم | من دەمەوێت هەستم |
| Az t,vem b,ciúm dest nevésia | ئەز بچوم دەستنەڤێژا، |

دەمەوێت خۆم پاک بکەمەوە (عیبارەتێکی بەئەدەبی کوردی).

| | |
|---|---|
| ئەز تــڤێم میزوم | دەمەوێت میز بکەم |
| ئەز تـڤێم بـکەروم | دەمەوێت بکڕم |
| نان | نان |
| مێی ( گوتنی بە یەک برگە) | شەراب |
| عارەق | براندی |

[ من پاشماوەی لیستەکەی ئەم وشانەی لێرەدا بەسەریەکەوە دەنووسم : ]

گۆشـت، پەنیر، ئێک( واتاهێلکە)، رون، نیڤیشک، شیر، ماستی ( واتا puina) [ پـوینا لە ئیتالیا شتێکە لەنێوان ماست و جۆرە پەنیرێک، جۆرێک ریکۆتا]، ئەنگڤین، دوشاف، ماهسی( واتا ماسی)، نیسک، دیکەل(واتا کەڵەشێر)، میریشک، ڤۆردەک( واتا مراوی)، کۆتەر، کیڤریشک، بیرینج یا برێنج، ساڤار( واتا farro) [ فاررۆ: گەنمی کوڵێندراو کە لە ئیتالیا وەک برینج دەخورێت، بـەڵام گەنمی هەر ساغ، نـەهاڕدراو]، Kohhe خوێ، مێڤا، تری، مەڤیس سۆر( واتا مێوژی سوور)، مەڤیس رەش[وشەیzibibbo زیبیببۆی بۆ مێوژ بەکارهێناوە،رەنـگە ئـەوەی لە ژێر تـەئسـیری عـارەبیی مووسـڵدا بـووبێت، بە عارەبی بە مێوژ دەڵێن زبیب . زیبیبۆی ئیتالیش هەر لە " زبیب"ی عارەبی وەرگیراوە، بەڵام بە جۆرێک ترێ دەڵێن و بە شەرابێکیش کە لەو ترێیە دروست دەکرێت]، بایف، ئارمیک (واتا هـەرمێ)، سێف (واتا سێو)، Beh بێە ( واتا بەهێ)، ئەنار، ئەهلوچەک (واتا هەڵووچکە)، ئەهلوک(واتاهەڵووچە)، ئەژیر(واتا هەنجیر)،Ghús گوێز، بەندەق، خۆخ، خیار، شووتی یا دەبەش، پیڤاس، خورما .

سیر ( "س"یەکە لە نێوان ددانەوە دەگوترێت).

دۆDàu (بە یەک بڕگە)     پوینای کە لە ئاودا دەتوێنرێتەوە و بۆ فێنکایی دەخورێتەوە.

حەلاوە Ahhlàu,e : تۆررۆنێ، شـیرینییەک لە هـەنگوین یا شـەکر و ئـارد و بادام و گوێـز و فندق یا کـونجی دروست دەکرێت[ تۆررۆنێ بە ئینگلیسی : نووگا nougat، شیرینییەکە بە شـەکر و هـەنگوین و گوێـز و بـادام( و فندق و پستە) و سـپێنەی هێلکە دروست دەکرێت].

لێرەدا دەمەتەقێیەکی کەم بۆ پێکهێنانی چەند بیرێک لە بارەی زمانی کوردییەوە دەکەم بە کۆتایی ئەم رێزمانە .

[لایەکی کوردییەکەیە و لایەکەی تری مانا ئیتالییەکە. ئەوەی لە ناو دوو کەوانی وەهادا-یە : ( )، وەرگێرانی ئیتالییەکەی بەرانبەرییەتی، یا هەر دەقی ئەسڵەکەیە چ ئیتالی و چ کوردی] .

ئاخافتنا بەین دوو ئاغا موسولمان

ئیسماعیل و موستەفا

ئیسماعیل : سەلام عەلێیک

موستەفا : عەلێیک سەلام و رەحمەتا ئەڵلاهـ

ئیسماعیل : سەباح ل خێر . کەیفاتە چاڤا.

موستەفا : ئەلحەمدُئەڵلاهـ (یا : شوکەر خودێ) قەنجە . تو چاڤا

ئیسماعیل : شوکەر خودێ.

موستەفا : هاتنا تە، ئینشاڵڵا خێرە.

ئیسماعیل : ئینشاڵڵا خێرە . یاری مەن عەزیز . ئەز هاتوم نەک تە خاتەر یەک پێشیارا (من بە داوایاک هاتوومە لای تۆ) نیاسوم دلێ تە قەنجە گەل من ؛ و پێناستوم پێیداکەم یەک ئەژ تە ئەمینتەرا .

موستەفا : سەر سەرێ مەن . بو خدمەتا تە چو تەقسیر ناکەم .

ئیسماعیل : خودێ ته ئاوێز کەت (Avéz ket خزمەتت بکات) [ دەبێت "عـەوێز" لە "عوض"ی عارەبییەوە بێت] . تە عاجز نـەکا، ئەگەر بو تە بێژم چی سەر مەن هات .

موستەفا : تـەکلیف بلا کەنارەک، ئەو، بێین مە، بەتال ( با تـەکلیف وەلابنێین، ئەوە لە نێوان ئێمەدا نیە).

ئیسماعیل : گۆه بدەی مەن، بو تە هـەموو ئاشـکەرا بێژم . پار میر مە ڤرێکریا سـەر چار گوند خاتەر دراف(بۆ پارە) بستینم . مەن باوەر کریا(١) کە کەس حشـیار نابیت[ ehhsiárnábit لێرەدا لەبیری چووەتەوە کە sc ی وەکو ئیتالییەکە بۆ " ش" دانابوو] . مەن سـتاند هـەزار قـروش زیـدە بو مـەن؛ مەرۆڤـەک گـوند ( نازانم کییە) شـکایەت دا نـەک میر . ئەو ahhzer حـازر؟ ئەژ مەن کەربا (٢) ڤەکیریا،مە دەرمخست(نەفیکردم)، پاشی تالانکریا مالێ مەن(دوای دەست بەسـەرداگرتنی مالّم)، و سـتاند هـەموو پـەز، و ئێستەر؛ نوک(ئێستا) تو فەکەر بەکە، چاڤا(چۆن) ئـەزsciáp erza شەپعەرزا!(پەندم پێدرا، فێلّم لێکرا)، حەزکەم کە تو نیشان دێی مەن چیێ لازمم چێبەکەم .

---

(١) مەن باوەر کریا، کە کە کەس حشیار نابیت واتا : لام وابوو کەس پێی نازانێت .

(٢) ئەژ مەن کەربا ڤەکیریا واتا : زۆر لێم تووڕە بوو.

موستەفا : دەل[دڵ]خۆ خەراب نەکە(٣)،عەلاج ئەوی زەحمەت نینە . ئەو رەنگ چێ-
بکا(وەها بکە)،بنڤیسیا یەک مەکتووب بومالخۆی(٤)و گەل مەکتووب ڤرێبکە
دوو کیسە(٥) و کرار بەکا(وێرای بەڵێنیەوە کە) ئەگەر شۆغلێتە پێک ئینیت
سێ کیسا کـئیدی، ئەمما ئەو بەسسا نینە، هەم لازم ڤێرێرکێی یەک دیاری بو
میرا(ئـەمیرە، هاوسەری میر) ئەژ رەنگ ئەوی، خاتەر گەل میر ئـاخاڤت، کە
چو جار بێ دەل ئەوی ناکەت(٦).

ئیسماعیل : بو میر تەشتەکی تـڤێت ؟

موستەفا : مەعلووم . ئەو کەفشە (روونە).

ئیسماعیل : نەزانم چیێ لێ دێم (چییان بدەمێ).

موستەفا : مالخۆی بو تە بەنێڤیسیت، چیێ لازمم.

ئیسماعیل : کیڤە پێیدا کەم هەندا دراف ؟

موستەفا : تو مەرۆڤی شـاتەر(خێرا) [ شاطر، زیرەک] نینە . تو چو جار تە نابیست، ئـەوی

---

(٣) دل خۆ خەراب نەکە عیبارەتێکی کوردییە واتا دڵی خۆت مەشکێنە، خۆت
مەشێوێنە .

(٤) Malkoi ناوی پیاوێکی گرنگ .

(٥) دوو کیسە، کیسەیەکی تورک دەکاتە ٢٥٠ سکودۆ، بەڵام هی کورد دەکاتە ٣٧٥.

(٦) بێ دەل ئەوی ناکەت عیبارەتێکی کوردییە واتا بێ دڵیی ئەو ناکات .

چاڤا چێکریا مامێ تە دەهـ ساڵی بەر ئایکا (پێش ئێستا) ؟ چێبکە سـیبی ئەوی ( وەکو ئەو بکە) . تو دێین بستینە (قەرز وەرگرە) چەنت ئەوجە بیت (چـەند پێویسـت بێت)، و پاشـی کەنگی جارێ کیدی میر دەل(٧) خۆ چێکریا گەل تـە ( وە بەر لوتفی میر کەوتیتەوە)، و گەیشـتیا مال؛ تو هەیە گەلەک فـەلاح (٨) رەعایا تە کە فرانگی بوو؛ تو ئەو حیججێت( بەهانە) بگرە، و وان بدێی ناڤ زەنجیر(هەرڕۆ هەرڕۆ هەموو پاشای رۆمی چێکێت)(هەموو رۆژێک پاشای عوسمانی وا دەکات) و بستینە ئەژ وان زێدە چیێ تـاوجە بوو( پتر لەوەی کە پێویستت بوو). هـەر فـەلاح کە دەبیت فرانگی franghi ، لازم حیسـاب کەر دوژمن ئەژ مسوڵمان . چیێ تـڤێت سانایتەرە ؟ (چیت دەوێت لەوە هاسانتر؟).
ئیسماعیل : ئـەگەر بو تە راست بێژم، هێندە ئـەز ئـاللۆزی بوو(٩) سەر ئەو شـۆغۆل؛

---

(٧) دەل خۆ چێکریا گەل تە عیبارەتێکی کوردییە (بە حەرفی : دڵی کرد لەگەڵت) .

(٨)Fallahh فەلاح، ئەو ناوە واتا جووتیار/دێهاتی . بەڵام بۆ کینەی‌ئاینیی بەرانبەر ئەوهەمووە مەسیحییانەی رۆژهەڵات و،ئەوروپاییش : فرانکی، وا بە مەسـیحیی کاتـۆلیک دەڵین، لەلایەن ئـەهلی بیدعـەتەوە داهێنراوە تاکو لای تـورکان کینەیان بەرانبەر هەبێت .

(٩) Allozi ئاللۆزی، ئەو وشەیە بۆ ئەوە بەکاردێت کە کەسێک سەری لێ بشێوێت و نەزانێت چی بکات .

که ئەز هەموو مەن سبیرکریە.

موستەفا : خەما ئیدی نە هەلگرە . چێبکە چیێ مەن گۆت بو تە، و کێیفا خوە ئینە .

ئیسماعیل : فکرێ تە مە تەناکریا (ئارامی کردمەوە)، ئەز ئەڤ تە بچوم قەوی رازی . خاتەرا تە.

موستەفا : ڤەگەرا تە خێر.

ئیسماعیل : خۆدێ شۆغۆلێتە دایمەن راست ئینیت. هەزار سالی بیت . خۆدێ بەهشت دێت بو تە .

ڤۆکابۆلاریۆ

بۆ ئاگاداری

ئەوانەی لەم وشەنامەیە دەنۆڕن،دەبێت زۆر بە وردی ئاگایان لە پیتەکانیدەنگیناوەندی وشەکان و، ئیشارەتەکانی دەنگی قوڕگی ببێت، چونکە زۆر وشە هەن کە مانایان زۆر جیاوازە و لە نووسیندا ئەگەر بە ئیشارەتەکانی بەسەریانەوە نەبێت لێکنـاکرێنەوە، بە نموونە : پیاPia بێ هیچ ئیشارەتێک واتا پیاوێکی گرنگ، بەڵام پیا piá بەو ئیشارەتەی بەسەر دوا پیتەکەیەوە واتا : پیادە . غیرە Ghira بەو خەتە بەسەرەوە واتا : رووح، رووحییەت، حەماس، بەڵام بە بێ ئەو خەتە بەسەرەوە Ghira واتا : جەغز.

بۆ هاسانکردنەوەی دیتنی گەردانی کردار(جگە لە کرداری ناشەخسی) هەمیشە بە کەسی یەکەمی دۆخی کاتی ئێستای خەبەری دەستپێدەکەم، ئەوجا کەسی دووەم و، رابردووی نیزیکیشی دەنووسم؛ ئەوەم بە پێویست دیت، چونکە زەحمەتە بزانرێت ئەو کردارە لە گەردانیدا کامەیە و،لە رابردوویدا چ گۆڕانێکی بەسەردێت،وەک لە رێزمانـدا دەبینین، بۆ هەمان شت" نەرێنی"ی کەسی یەکەمی دۆخی کاتیئێستای خەبەرییشی دەخەمە پاڵ،بەوە کە خوێنەر دەکرێت لە کردارێکدا کە بە" نا، نە "دەستیپێنەکردبێت، نەرێنیی تێدا نەبینێت و لێیبشێوێت، چونکە خۆ ئەو" نا، نە"یەی نەرێنی هەمیشە وە پێش کردارەکە ناخرێن، دەکرێت لە ناوەندی وشەی کرداردا بێت، بە نموونە : ئەز پێوەستوم واتا من دەتوانم، بۆ"من ناتوانم" دەبێت بڵێیت"ئەز پێناوەستوم"، زۆریتریش وەهان . بۆ کرداری لێکدراویش هەر یەکەم کەسی دۆخی کاتی ئێستای خەبەری

دەنووسم، بەڵام ئەوەی کەسی دووەم و رابردووی لێ وەلادەنێم، چونکە - هەروەک لە ڕێزمانەکەدا باشم روون کردووەتەوە- هەموو کردارە لێکدراوەکان یا بە " کردن" یا بە "دان" دروست بوون . بەم شێوەیە لام وایە ئەم وشەنامەیەم روونتر لێ کردبێت .

[ ئەم وشەنامەیە، لیستی وشەی ئیتالی و کوردییەکەی گارزۆنی لەبەرانبەریدا، من چی لێ بکەم ؟ زۆرم بیر لێکردەوە و نەگەیشتمە نەتیجەیەک . ئەگەر ئێستا بمەوێت کار - بڵێین- لەسەر فەرهەنگەکەی تەوفیق وەهبی و ئەدمۆندز بکەم، ئەوا دەزانم دەکرێت چەندە کاری لەسەر بکەم : لە "کوردی -ئینگلیسی"یەوە بیکەمە "ئینگلیسی- کوردی"، یا "کوردی- کوردی"، یا کوردی و هەر زمانێکی تری ئەوروپایی کە بیزانم، یا ئەگەر هەر لیستی وشەکانی ریز بکەم و هیچی تر، دەبێتە کارێکی لەجێی خۆیدا، بەڵام ئەم وشەنامەیەی ئەم کوردییەی گارزۆنی ئەمڕۆ بە کەڵکی چی دێت ؟
وشەنامەکە ٢٠٦ لاپەڕەی گرتووەتەوە، کە زۆرتر وایە لاپەڕە لە نێوان بیست وشە و تا سي وشەی وەخۆگرتووە، بەهەمووی دەگاتە سەرووی چوارهەزارو پێنجسەد وشە، من زۆرشوێنیم سەیرکرد، گوتم بەڵکو شتێکی وەهای هەر تێدا ببینمەوە کە بیری ئەوەم بداتێت کارێکی لەسەر بکەم، بەڵام هیچم تێدا نەدیت .
بە ئاگاداربوونی خوێنەر لە تائیرەی کتیبەکە، رەنگە لە پێویستیشبەدەر بێت کە پێیبڵێم حەتمەن دەبێت چاوەڕێی ئەوە لە وشەنامەکەشی بکات کە، هەڵە و قسەی سەیر و بێ سەروبەری تێدا کەم نەبن، بەڕاستی کەم نین و زۆریشن . دیارە دەکرێت وشە بە وشە

لەسەری بوەستم و، لێبکۆڵمەوە کە دەبێت مەبەستی لە وشە کوردییەکە چـی بووبێت و ئەگەر هەڵە بێت هەڵەکەی لەکوێدایە و زۆری لەسەر بڕۆم، چونکە زۆری ئەوەی ئەو دەیڵێت ئیتر وەکو مـەتـەڵ وایە، بـەڵام ئەو هەمووە کارە بۆچی و بە کەڵکی کێ دێت ؟ ئەو کاتەی کە ئەوە دەیگرێت بۆ شتێکی تری بەکەڵک تەرخان بکەم باشتر نیە ؟

دیسان، وەک پێشتر لە باسی رێزمانەکەشـیدا گوتم، شتێک هەر بە نموونەی مشتێک لە خەڵواری وشـەنامەکەشـی بۆ ئاگاداری : یـەکەم وشـەی لیستی هـەر پیتێک لە پیتەکانی ئیتالییەکەی و بەرانبەرە کوردییەکەی دەخەمە بەرچاو .

وشـەنامە، وشـە بە ئیتالی دەنووسێت و دەڵێت بەرانبەرەکەی بە کوردی چییە . ئـەلف-بێی ئیتالی" J,K,W,X,Y"ی تێدا نیە، ئەوانە - هەرچەندە وادەبێت ئیتالی بۆ هێندێک وشەی بێگانە دەیاننووسن بەڵام - لە ئەلف-بێی زمانی ئیتالیدا نین، لێرەدا H یـشی تێدا نیە، هەرچەندە H لە ئەلف-بێی ئیتالیدا هەیە بەڵام بێ دەنگە(بەنموونە : ho ئۆ)، دوو پیتی"u,v" یش لێرەدا هەر کراون بە یەک(V) .

یەکەم وشە لە هەر پیتەی بەمجۆرەیە : ]

A Bada - Mežúl.Tenere a bada- Mežúl tkem,occupato faccio.

بە ئینگلیسی دەبێت بە:

at bay- mežúl- to keep at bay- mežúl tkem, doing busy

شوێنی ئەوە دەبێت لای پیتی B بێت، نەکA ، چونکە ئەمە وەکو ئەوەیە کە لە فەرهە-
نگی زمانی کوردیدا " لە ماڵی خۆمان" بخەینە پیتی" ل"ـەوە . خۆ A ی ئیتالییەکە بەو
جۆرە لە" لە"ی کوردییەکەش پتر دەگرێتەوە، دەبێتە : بۆ، بە، لە...، بەڵام خۆشبەختانە
گارزۆنی لێرەدا هەر بەوەندە کۆتاییهێناوە . A دەبوو بەتەنیا یەکەم وشە بوایە . نازانم
گارزۆنی ئاگای لە چقامووسێکهەبووە، یـەکەم وشـەنامەی ئینگلیسی-لاتین و لاتین-
ئینگلیسی ساڵی ١٥٣٨ دەرچووە، یـەکەم قـامووسی ئینگلیسی - ئینگلیسی ساڵی ١٦٠٤
بووە،کە هەر ناوی قامووسەکە یەک لاپەڕەی تەواوی گرتووەتەوە . یـەکەم قامووسـی
زمانی ئیتالی " ڤۆکابۆلاریۆ ئاکادیمیچی دێللا کروسکا" ساڵی ١٦١٢ بڵاوبووەتەوە .
ئەم مانالێدانەوەیەی ئێرە، بەشی دووەمی" مژول تکەم، مەشغوولدەکەم" تێدەگەم، بەڵام
to keep at bay واتا" خۆ لێ دوور گرتن،لە خۆ دوور گرتن " لێرەدا شوێنی نیە .

Bacca – Tove, cioè semenza.

بە ئینگلیسی دەبێت بە

Berry – tove, i.e. seed.

بە " توو" دەڵێت : تۆڤێ" یا" تۆوێ" و دەڵێت ئەوە هەمان تۆوە کە دەیچێنین، واتا کورد
بە تووش هەر دەڵێن توو.

Cabala – Ramel

بە ئینگلیسی Kabbala : " قباڵە"ی باتینییەتی ئاینیی جوو، بە کوردی : رەمڵ ؟

Da, segno dell'ultimo caso- Eẍ, o sia Ez.

وشەی " دا "ی ئیتالی وا مانا لێدەداتەوە کە : بە کوردی " ئـەژ "یا " ئـەز"، ئیشارەتی دوا دۆخە ، مەبەست ئابلاتیڤ " لە ..."، تا لە ماناکانی تری da ی جیابکاتەوە .

E, copula , U      e ی ئیتالی = and ی ئینگلیسی، بۆ پێوەندی، بە کوردی : و

Fabbrica- Avàiia –

فابریکا ، فابریقە، کارگە، کارخانە، بە کوردی : ئاڤاییا .

وشەی دوای ئەوش Fabbricare ، بە ئینگلیسی to manufacture بووە بە : ئاڤاتـکەم .

Gabbare – Ahhilàt Kem, Lēbi cekem

بە ئینگلیسی to cheat : فێڵ لێ کردن، قۆڵبڕین... ، دەڵێت بە کوردی :

Ahhilat Kem ئا حیلەتکەم، Lebi cekem لێبی چێکێم؟

Idolatra . Sanàm perést

بتپەرست بە کوردی : Sanam perést سەنەمپەرێست.

Là, Lúe

Là واتا ئەوێ، لەوێ، بە چەند شێوەی تریش لەعیبارەتدا بەکاردێت، لیرەداLúe لـ وێ

Ma . Amma

Maی ئیتالی واتا : بەڵام، لێرەدا : ئەمما

Nacchera, instrumento piccolo ad uso di tamburo,Nakàra.

Nacchera ی ئیتالی، لێرەدا دەڵێت : ئامرازێکی بچووکە بۆ تەپڵ بەکاردێت و بە کوردی : Nakàra . " نقارە" ی عوسمانی هەر بە تەپڵ گوتراوە و، بە زاراوە بە تێکڕای دەهۆڵ و زوڕنا و ئامرازی تریش(چاڵغی)یەک گوتراوە کە لە شوێنی گشتی یا لە گەورە ماڵان (لای مهتر، مهتران) لێدراوە، وەک بڵێین " دەهۆڵ لێدان" لەجیاتی " باندی مووسیقی کاری بکات".

O, particola separativa, la, per domandare uno, O, i Jazidi dicono , Lo lo

o بە ئیتالی واتا : یا ، هەر واشی مانالێداوەتەوە la ، بـەڵام " ئۆ" ی کوردییەکەشـی لێرەدا وەبیرهاتووەتەوە و دەڵێت O : بۆ داوا یا پرسیاری یەکێک، یەزیدییەکان دەڵێن لۆ لۆ.

Pacciame- kassavàt

پاچامێ(لێرەدا نووسراوە Pacciume، دەبێت هەڵەی چاپ بێت یا وا لە شێوازێکدا هەبێت یا هەبووبێت)ی ئیتالی، بە ئینگلیسی دەبێتە mulch مەڵچ : بەو وردە تەختەی تەڕ و گەڵا و کا و پووش و پەڵاشە دەڵێن کە وادەبێت جووتیار زەوی پێ دادەپۆشن . لێرەدا کوردییەکەی بە " کەساوەت " یا " کەسافەت" داوە .

Qua, Lera, Era, Venàve

Qua کوردییەکەی لێرەدا : لێرە، ئێرە، ڤێناڤێ هەڵە نیە بەڵام لە ئیتالیدا لە سیاقدا ئەو مانایە دەدات، بە نموونە: لە " لێرە و لەوێ"دا بۆ لێرەکە بەکاردێت، ئەینا ئەگەر هەر تەنیا بڵێین ئێرە یا لێرە یا ڤێناڤێ، شتی تر دەڵێن .

Rabarbaro, medicina- Rahvènt

Rabarbaro واتا ریواس، وا لێرەدا دەڵێت دەرمانە و،کوردییەکەی بە Rahvènt دەدات، عارەب پێی دەڵێن" راوند"، رەنگە گارزۆنی ئەوەی لە عارەبی مووسڵ وا بیستبێت.

Sabbato- Sciàmbi

ساباتۆ( رۆژی سبت، شابات – ئارامی) شەمبی : شەممە.

Tabaccare, prender tabacco per il naso – Bornùti kesciùm

Tabaccare تووتن وەبەر لووت دان – بۆرنوتی کێشوم .

Vacanza- Batàl

Vacanza بە ئینگلیسی دەبێت بەholiday,vacation،کوردییەکەی لێرەدا: بەتاڵ!

Zaffarano- Zafràn

قامووسی ئیتالی دەڵێت:"زافارانۆ" لە "زعفران"ی عارەبی و ئەویش لە" زردپران"ی فارسی . وا گارزۆنی لێرەدا کوردییەکەی بە "زافران" داوە .

دوعا و نوێژی یەکشەممان

[بە کوردییەکەی دەست پێدەکات و دەقی لاتینەکەی بەدوودا دێت]

بابێ مە کە دەرونیت سەر ئاسمان : موقەددەس بیت ناڤێ تە.

بدەیێ ئا مە بەهەشتێ تە [ ئەمە لە لاتینەکەدا نیە].

دەبیت ئامرادا تە سەر ئاسمان، ئو سەر ئەرد.

ئەوڕۆ و هەر روژ تێرا نان بدەی ئا مە.

و عافو بکە گونا مە، سیبی ئەم عافە بەکەم هەر کەس چیکریا مە زەرەر، یا زەحمەت

و نەئاڤێژە مە ناڤ تەجەریب .

ئەمما خەلاس بکە مە ئەز خەرابیا . ئامین .

سڵاوی فریشته

[ دوعایەکی کلیسایی، سەرەتا کوردییەکەی و چەند وشەی عارەبیی تێدا، دوای ئەوە لاتینەکەی]

سلام لک، یا مریم؛ تەگی نامێ تە خۆدێ، الرب گەل تە؛ مبارک تە بین زنان، و مبارک مێڤا زکێ تە سیدنا*عیسا . قدوسە مریم دایکا خودێ نەڤێژا بکە بو مە گوناکار؛ نوک و ل سەعات مریا [ مردنی] مە . ئامین .

---

(١) سیدنا، واتا ئاغامان، وشەیەکی عارەبییە و کوردیش لە ناوهێنانی پێغەمبەرێکدا، بۆ رێزلێنانی زۆر، دەیڵێن؛ وەکو " سلام لک" یەکەش، و " الرب"یش وشەی عارەبین بەڵام لە دوعا و نوێژدا دەگوترێن .

["سڵاوی فریشتە"دەکەوێتە لاپەڕە٢٨٤ی کتێبەکە،لاپەڕە ٢٨٥ی وێنەی مەرسوومێکی کلیسایە بە زمانی لاتین، لاپەڕە٢٨٦و٢٨٧ لیستی هەڵەنامەی وشە کوردییەکانییەتی و، گارزۆنی لە دوا لاپەڕەیدا(٢٨٨) دەڵێت کە بە پێویستی نەزانیوە هەڵەی چاپی وشەی ئیتالی راستبکاتەوە، چونکە ئەوانە روون و لەبەرچاون و، دەڵێت کە بۆ رێنووسی کوردییەکەشی، کە ئەو هیچ کتێبێکی بۆ سەیرکردن و بەراورد بۆ ئەوە بە دەستەوە نەبووە، دەکرێت هەڵەی تێدا هەبن. ئیدی کتێبەکە بە عیبارەتیلاتینی : Lode A Dio (ستایش بۆ خودا) بە خەتی درشت کۆتایی دێت .

ئەم کارەی منیش بە بڵاوکردنەوەی وێنەی مەرسوومە لاتینەکە و وەرگێرانی کوردیی بەدوودا کۆتایی دێت] .

# DECRETUM

*Sac. Congreg. generalis de Propaganda Fide hab. die 27. Novembris 1786.*

REferente R. P. D. Stephano Borgia Secretario, valde profuturum, si ad informandos Operarios, qui ad excolendam Domini vineam in Mesopotamiam mittuntur, Grammatica, & Dictionarium linguæ Kurdæ a Rev. P. Mauritio Garzoni Ordinis Prædicatorum, emerito Missionario elucubratum typis mandetur; Sacra Congregatio rei utilitatem perpendens decrevit, ac jussit, ut eadem Grammatica, & Dictionarium linguæ Kurdæ typis, ac sumptibus ipsius Sacræ Congregationis accurate excudatur.

Datum Romæ ex ædibus prædictæ S. Congregatinis die, & anno, quibus supra.

L. CARD. ANTONELLI PRÆF.

*S. Borgia Secretar.*

فەرمان

کۆڕی گشتیی پیرۆزی پڕۆپاگەندەیعەقیدە، بە دەسەلاتێکی پێی دراوە، ٢٧ی نوامبری ١٧٨٦.

بە گوێرەی راپۆرتی زۆر بەڕێز مامۆستا " ستێفان بۆرجە"ی سکرتێر، زۆر بەکەڵک دەبێت ئەگەر کرێکارانی کە بۆ کاری رەز، کاری خودا، ناردراونە میسۆپۆتامیا، لەوێ، رێزمان و وشەنامەی زمانی کوردیی مامۆستای بەڕێز ماوریتیوس گارزۆنیی تەریقەتی دۆمینیکانی بخوێنن؛ ئوستاد، قامووسێکی زمانی کوردی بە چاپ (ی بلۆکی تەختە) ئامادە کردووە، کە کۆڕی پیرۆز، لە روانگەی ئەوەوە کە بەکەڵکە، فەرمانی دا و بە مەرسووم بڕیاری دا کە ئەو هەمان قامووسە چاپکراوەی زمانی کوردی، لەسەر ئەرکی کۆڕی پیرۆز خۆی بە چاکی بەرهەم بهێنرێت [ چاپ بکرێتەوە] .

ئەمە دەرکرا لە : رۆما، ئیدارەی کۆڕی پیرۆزی باسکراو، لە رۆژ و ساڵی لەسەروو ئیشارەت پێکراودا .

ل. ئانتۆنێللی - کاردینال و پریفێکت [ بەڕێوەبەر، پلەیەک لەخوار ئوسقوف/مەتران].

س. بۆرجە - سکرتێر .

# GRAMMATICA
## E VOCABOLARIO
## DELLA
# LINGUA KURDA

COMPOSTI

DAL P. MAURIZIO GARZONI
De' Predicatori Ex-Missionario Apostolico




Tojer u Wergêr :
Şêrko Hejar
2018

Arşîf : Hêdî

ROMA MDCCLXXXVII.

Nella Stamperia della Sacra Congregazione
di Propaganda Fide

CON LICENZA DE' SUPERIORI.